# التوكل بە كوردی

# پشت پێ بەستن

## زنجیرێک لە کردەوەکانی دڵ

### لە روانگەی قورئان و فەرموودە




نووسینی :

محمد صالح المنجد

وەرگێرانی :

قاسم محسن عولا



1444هـ 2023م

# بسم الله الرحمن الرحيم

## پيشه كى :

إن الحمد لله ،نحمده ونستعينه ونستغفره ،ونعوذ بالله مـن شـرور أنفسـنا وسـيئات أعمالنـا مـن يهده الله فلا مضل له ،ومن يضلل فلا هـادي لـه ، وأشـهد أن لا إلـه إلا الله وحـده لاشـريك لـه ، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾.[١]

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾.[٢]

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ .[٣]

---

[١] - سورة ال عمران (١٠٢).
[٢] - سورة النساء (١).
[٣] - سورة الاحزاب (٧٠-٧١).

نامەی توکل یان پشت بەستن ئەویش کردەوەیە کە لە کردەوە کـانی (دڵ) ، پشـت بەسـتن بـە (خـوای بـەرزو بلنـد ) مەنزیلکی یان پیگەیەکی زۆر گەورە و  مەزنە ، وە یەکیکە لە گەورە تـرین واجباتـەکانی بـاوەر ، وە گـەورە تـرین پایە بەرز ترینە لە کردەوە کانی  خوا  پەرستی و عیبادەتی کردنی خوای گەورە ، هەروەك ئەم کردەوەیە زۆر نزیکت دە کاتەوە لە (الرحمن )  خوای میهـرە بـان ، وە پشـت بەسـتن پیگەیـەکی یـەکجار گـەورە لـە یـەك تـا پەرسـتی و منزلگای (توحید ) و  یەکخوا پەرستی  خوای گەورە و بـەرزو بلنـد ، هـیچ شـتیك بەدەسـت نایـەت ئەگـەر پشـت نەبەستی بە(خوای بەرزو بلند ) ، وە دوای یارمەتی هاریکاری لی نەکەیت (استعانە ) ..!!

وە ئیمەش بەو ریگایە دەرۆین باس لە م پەرتووکەدا پشت بـەخوا ،بـاس  لـە مانـای (التوكـل ) یـان پشـت بەسـتن دەکەین ، وە راست و دروستی (التوکل ) یان پشت بەست ، وە هەروەها سوودەکانی پەشت بەستن و ،وە ئەو شتانەی کە ریگرن و یان پیچەوانەی پشت بەستن ، وە ئەو چیرۆکانەی کە چیاو چاکان لەسەر پشت بەستن بەخوا باس دەکەین ، بەلی مەبەست لەوەرگیرانی ئەم پەرتووکە ئەوەیە کـە کۆمـەلیك لـە کـردەوە کـانی (دڵ ) شـیخ محمدصـالح المنجـد نووسیتی وەك ریگایەك بۆ زانینو ناسینی (خوای بەرز و  بلند ) بە شیوازیکی زانستی ، کە چۆن لە کـردەوە کانمـان پشت بەبەستین یان نیەتی پاك مان هەبیت و گومانی راست و دروست بەخوای گەورە و بەرزو بلند میهرەبان ببەین، بەلی پشت بەستن بە خوای بەرز بلند باوەری تەواو بە ئادەمیزاد دەبەخشیت و ، لە خۆشی و ناخوشی دا تەنها پشت بەخوا دەبەستیت ، دەبیت لە هەموو کارو کردەوە کانمان پەشت بە خوا ببەسـتین ، وە لـە پەرستنەکانیشـمان تـەنها ئەو بپەرستین دوای پال پشتی یارمەتی هەر لەو زاتە بکەین ، هەموو کاریك بە پشت بەستن بەخوا ئەنجامی بـەدین بەلان نابیت لە کارو کردەوە خواپەکان بلین پەشت بەخوا ، یان لە هەر کاریك کە ئەنجامی دەدەین ، دەبیـت هـەولی ئادەمیزادی لە گەل دا بیت لە پیشد بلین پەشت بەخوا ئەنجامی دەدەین ، چونکە هیچ کردەوەیەك دروست نیـە گـەر هەول تەقەلای ئادەمیزادی لەسەر نەبیت ،پاشـان نیـەت پـاکی لـە کـردەوە کـەدا دەبیـت هـەبیت وە گومـانی بـاش بردنیش بەخوا هەبیت ، چونکە زیان سوود لە هەر کردەوەیە دا بەدست ئەو زاتەیە  ،ئەگەر نیەتمان باش بیت بەخوا ئەوا سوود لەکردەوەکانمان دەبینین ، هەمیشەو بۆ بەردەوام دەبیت پشت بەخوای گەورە بەرز بلند بەبەستین ، شیخی پایە بەرز شیخ م(حمدصالح المنجد) ئەم پەرتووکەی وە فیرکاری و چۆنیەتی پشت بەست بـەخوا نووسـیوە کـە بەنـدەی موسلمان فیری چونیەتی پشت بەستن بەخوای گەورە و بەزرو بلند بیت ، چونکە پشت بەست ئەویش یەکیکە لە کارو کردەوە کانی (دڵ) کە ئادەمیزاد ئەنجامی دەدات ،پشت بەخوای بـەزرو بلنـد ئیمـەش بـە پـی توانـا ئـەم پەرتووکـە وەردەگیرین نەسەر زمانی شرینی کوردی ، لە خوا دەپاریمەوە لە هەلەو کەم کوریە کانمام خۆش بیت ، ئەوەشی راست و دروستە پاداشتی قیامەتم بیت ، (وە دوا لە (خوای گەورە ) دەکەین لە خیرو پاداشت بی بـەشمان نـەکات، وصـلی الله وسلم علی نبینامحمد وعلی اله وصحبە أجمعین ).

## گرینگی بابەتی پشت بەستن  بە  (خوای بەرزو بلند )

لە(سعيد بن جبير ) – رحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : ( پشت بەستن بە (خوای گەورە ) هەموو ئیمانە یان باوەرە ) .[٤]

لە (ابن القيم ) – رحمەتی خوا لی بیت -  دەلیت : (پەشت بە ستن بە (خوای بەرز بلند ) نیوەی ئاینە ، نیوە کەی تری بریتیە لە گەرانەوەی بەردەوام بۆ لای (خوای گەورە یە ) ، چونکە ئاین بەریتیە لە لە دوای کۆمەکی بەندایەتی ، وە پشت بە ستن بە (خوای گەورە) لە دوای کۆمەك (الاستعانە ) وە گەرانەوەی بەردەوامیش  بریتیە لە بەندایەتی (العبادە )  بەلکو بریتیە لە روحی بەندایەتی پالفتەی یەکتاپەرستی ، گەر خاوە نەکەی بەراستی پی هەستابیت ).[٥]

پەشت بەستن پەیویستە بەهەموو لە (واجباتەکان ، ومستحبە کان ، ومباحەکان ) بەلکو پیویست بە خاوەنی قەدەغەکراوە کان  کە ئەو شتانەی کە قەدەغەکراون لە لایەن (خوای گەورە )  وە پشت بەستن پەیوستە بەوانەیە کە مەبەستە بۆ بەدەست هینانی .

وە هەروەها پەشت بەست بۆ پیویستەیە زۆرە کانی خەلك ، لە سەریان پویستە کە پشت بە (خوای بەرز بلند ) وە ئەوانەی کە پەیویستە  .

---

٤ - مصنف ابن أبي شيبة (٢٠٢/٧).
٥ -ابن القيم مدارج السالكين (١١٣/٢).

له (ابن القيم )- رەحمەتی خوا لی بیت - دەلیت: ( وە ئەگەر بەدنە بەشت بە (خوای گەورە ) ببەستیت وە مافی پشت بەستنەکەی لە سرینەوەی یان لابدرنی چیایەك دا لەشوینەکەی وە فەرمانی لابردنی پیدار بۆ لابردنی ) .[٦]

موسلمان نابیت وا ببینی پشت بەستن بە (خوای بەرزو بلند ) بۆ هەمووکردەوە کانی کە ەرمانی (مستحبا ) بەلکو وا ببینی کەوا فەرزی ئاینە ..!!

له (ابن القيم ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : پەشت بەست هەموو ئەوانە دەگریتەوە کە لە منزلی رادەست کرن (**توفیض** ) لەسەر متمانەیە ، و دوای یارمەتی کردن ، وە رازی بوون ، تصور ناکردیت بە ئەوانە بوونی هەبیت ) .[٧]

له ( شیخ سلیمان بن عبدالله بن محمدعبدالوهاب ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : (بنچینەی گشتیە وە لیقەکە لە لقە کانی عیادەت و خواپەرستی ،ئەوەش پەشت بەست بە (خوای بەرز و بلند ) وە بەرەو رووی بەچیت بەراست و دروستی ،وە متمانەی (دڵ) بە پشت بەستن ، وە پوختەیەکی تاك گەریە ، وە کۆتای هاتنی لیکۆلینەوەی (توحید) یان یەك تا پەرستیە ،وە ئەوەش بەرهەمەی هەموو پیگەو منزل و شوینکی کە رەوشتی بەرز و کرامەتە لە خۆشەویستی و ترس و پارانەوە و رازی بوون بە پەروەردگار ، وە ئەوەش رازیە بە دادوەری (خوای گەورە) لەوانەیە بەندە بەگەیشتن بە پشت بوستن بۆ چیژ و لە زەتە لە ناخۆشی نەهامەتی بەلینکە لە نعیمەتەکان و شکۆمەندی (خوای گەورە ) ، وە کی ئەوەند میهرەبان لە بۆ هەر کەسیك بیەویت وە هەرچی بیەویت ،وە (خوای گەورە فەزل و بەخششیکی زۆرە گەورەو عەزیمی هەیە )[٨] .

[٦] - ابن القيم مدارج السالكين (٨١/١).
[٧] - ابن القيم مدارج السالكين (١٣٦/١).
[٨] - تيسير العزيز الحميد ص (٨٦).

# پیناسەی پشت بەستن

پیناسەی (التوکل ) یان پشت بەستن لەورووی زمانەوانی :

دەلین : (وکل باللە ) واتە  هەموو  بۆ خوا ، هەموو شتیك بشت بەستنە بە خوا ، یان پشت بەست لەسەری ، (اتكل ) واتە: تەسلیم بوونی دوورن یان نفسی خۆت بەخوا ، یان تسلیم بوون ، وە یان تسلیم بوون بە فەرمانە كان،هەلسان بە متمانە پی كردن وە یان زمانە ت وە گرتن وە یان گرینتی وەرگرتن  پی .

(كلت ) هەموو فەرمانی لە فلان كەس ،وە یان  من پشت دەبەستم بە فەرمان لەسەر ئە و .

و (وكل )  هەموو  پشت بە فلان و فلانا ،  واتە :ئەگەر نە توانی هەلسب فەرمانی نفسی خۆی ، یان متمانەی پی بكات بە كارە كانی وە بەفەرمانەكانی  .

وە هەموو فەرمانیك لەوە  وەیە ، وە تەسلمی دە كات یان رادەستی دەكات .[٩]

(التوكل ) یان پشت بەستن ، واتە: دەركەوتنی یان نیشان دانی بی توانایە وە متمانە كردن یان پشت بەست بە وانەی تر .

---

[٩] - لسان العرب (٧٣٤/١١).

## پێناسەی (التوكل ) یان پشت بەستن لە ووری زاروەوەی شەرعیەوە لەلای زایانان :

لە (ابن رجب ) – رەحمەتی خوا لی بیت – دەلیت : (ئەوە متمانەیە کە بەراوەیی یان راستی (دلە) بە (خوای پیرۆز و بەرزو بلند ) لە بەدست هینانی خیرو سوود ،وە بەرگری لە زیان بەخشین دەكات ، لە ژیانی دونیا دا وە لە دوا رۆژیش دا ) .[10]

وە لە (الحسن ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت :( پشت بەستنی بەندە بە پەروەردگار دەزانیت کە متمانەی بە (خوای گەورە ) هەیە ) .[11]

وەلە (الزبیدی ) – رحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : ( پشت بەستن متمانە کردنە لە لای (خوا گەورە ) ، وە بی هیوایە لە لایەن خەلکی یەوە ) .[12]

لە (ابن عثمین ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : (ئەو متمانەیە کە رەوایی راستی بە (خوای بەرزو بلند ) دەكات بۆ بەدست هینانی سوود ، وە بەرگری لە زیان بەخشین ، لە گەل ئەنجام دانی ئەو كردارانەی (خوای گەورە ) فەرمانی قی كردووە ) .[13]

لە (ئیمامی احمد ) – رحمەتی خوا لی بیت – دەلیت : پەشت بەستن بە خوا كاری (دڵ ) واتە : (التوكل ) كاریكە لە (دڵ ) دایە .[14]

یان ووتراوە : پشت بەستن بریتە لە كۆچكردن لە پەیوەستبوونەكان و گەیاندنی راستیە كان (هجر العلائق مواصله الحقائق ) .

[10] - جامع العلوم و والحكم ص(٤٣٦).
[11] - جامع العلوم والحكم ص ( ٤٣٧ ) .
[12] -تاج العروس ،مادة (وكل ).
[13] -مجموع فتاوى ورسائل ابن عثمين (٦٣/١).
[14] مدارج السالكين بە كوردي (٥٣٠)

# حەقیقەتی (التوکل ) یان پشت بەستن

بەلی حەقیقەتی پەشت بەستن ،ئەوە یە کە متمانە کردنی (دڵ ) بە زاتی (خوای بەرزو بلند ) لە گەل وەرگرتنی هۆکارەکانی ، لە گەل ئەوەی باوەری تەواو هەبیت کە (خوای گەورە ) رزق و رۆزی دەروە ، وە دورست کارە ، وە ژیان و مردنی بەدەستە ، جگە لەو زاتە هیچ خوایەکی تر بوونی نیە ، وە هیچ پەروەردگاریکی تر نیە جگە لەو . (التوکل ) لە (استعانە ) گشتگیر ترە ، چونکە (استعانە ) دوای یارمەتی کردنە لە (خوای بەرز بلند ) بۆ یارمەتی دانی بارو دۆخیك یان کاریك . بەلام (التوکل ) یان پشت بەستن دەچیتە نیو باری (استعانە ) چونکە پشت بەستن بە (خوای بەرز بلند ) بۆ یارمەتی تە بۆ هەر بارو دۆخیك ، وە هەروەها پشت بەست یان (التوکل ) لە (استعانە ) یان دوای یارمەتی ، فروانترو گشت گیر ترە ، بەلام (التوکل ) یان پشت بەست لەسەر (خوای بەرزو بلند ) بۆ بەدەست هینانی سوودە ، یان بەرگری لە زیان بەخشین ، وە هی تریش لە بارو دۆخەکانی ژیان دا .

لە ( ابن تیمیه) رەحمەتی خوای لە سەر بیت – دەلیت : پەشت بەستن بەرزکردنەوەیە بۆ پشت بەستن لەسەر (خوای بەرز و بلند ) ، بۆدامەزاندنی فەرمان پیکراوەی (خوای گەورە ) وە (التوکل ) یان پشت بەست بە خوای گەورە ئەوە یە کە تەنها لە خوا دەستت دەکەویت ، بەندە تواناو قەدرەتی نیە لەسەری ، بەلام (استعانە ) ئەوە یە کە لەسەر کارو بارە ، هەروەك (التوکل ) گشتگیرترە لە (استعانە ) وە ئەوە یە کە (التوکل ) یان پشت بەستن بۆ بەدەست هینان و سوود ، بەرگری لە زیان بەخشین ، هەروەك (خوای گەورە دە فەرموویت ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا مَا آتَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ سَيُؤْتِينَا اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَرَسُولُهُ إِنَّا إِلَى اللَّهِ رَاغِبُونَ﴾ .[١٥]واتا : خۆ ئە گەر ئەوانە رزای بوونایە بەو بەشەی خوا بە نسیبی کردوون و پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) پی بەخشیوون و بەدڵ بیان ووتایە : خوامان بەسە (کە لیمان رازی بیت ) ئیمەش فەرامۆش ناکات لە ئایندەدا هەر پیمان دەبەخشیت لە فەزل و زیادە ریزی خۆی ،پیغەمبەرە کەشی لەوەی دەستی دەکەویت پیمان دەبەخشیت ،بەراستی ئیمە ئاوات و مەبستمان گەرانەوەیە بۆ لای خواو بەدەستهینانی رەزامەندی ئەوە ئەو کاتە پاداشتی هەردوو جیهانیان بۆ خۆیان مسۆگەردەکرد..! !

---

[١٥] سورة التوبة (٥٩)



بەلام بەندە بۆ ئەوە دەیت دوای یارمەتی لە خوا بكات ،وە پشت ببەستیت بە خوای تاك تەنها و بی هاوتاو بی شریك .[16]

بی گومان ئەوەیە كەبۆ بەدەست هینانی سوودیك ، یان بەرگری كردن لە زیان پی بەخشین ،وە یارمەتی دان لەسەر پەرستن ، هەر وەك پشت بەستن گشتگیر ترە لە دوای یارمەتی كردن ،وە خوای گەورە كۆی كردۆتەوە بەدوو بنچینە یە لەم ئایەتی فاتحە دا كە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ .[17] واتا: خوایە تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لە تۆش داوی یارمەتی و پشتوانی دەكەین ، لە كارو بارەی دین و دنیاماندا ،بەكەسی تر لە بەندە كانت ناكریت .

وە ئەگەر هاتوو بارودۆخیك هاتە پیش ،لەسەر ئەوەی كە خۆزگە كەدیتە دی سوپاس ڤوزاری خوای گەورە بە ، وە لەهیچ شتیك مەترسە ، وە ئەگەر سەركەوتی لەسەر كریك یان فەرمانیك ئەوا لە خوا وە یە ، وە كاتیك گەرایتەوە بۆ لای خوای گەورە بە تەواوە تی ، ئەوا سەركەوتنی خوای گەورە ك پشت گیریت دەكات.

[16] -مجموع الفتاوى (١٧٧/٨).
[17] - سورة الفاتحة (٥) .

## گرتنەبەری هۆكارەكانی (التوكل ) یان پشت بەستن

كە پەشت بەستن به (خوای گەورە) بەهە ر حال مانای وانیە بۆ نەگترنەبەری هۆكارە ، چونكە پشت بەستن یان (التوكل ) پشت دەبەستیت لە سەر دوو فەرمان : وە باورە پی كردن یان متمانەكردن لەسەری ، وە لەگەل گرتنەبەری هۆكارە كان .

بەلام وا پیویستە كە ئاماژە یان تیبینی بەوە بكریت ، كە پویست نەكریت یان ئەعتماد نەكریتە سەر هۆكارە كان ، چونكە هەر بەندە یەك دەزانیت بۆ وەر گتنی هۆكارەكان ،بەلام ئەوە جوولە یەكی رۆیشتنی گەردوونیە ، ئەگەر سوودی هەبیت ، یان زیانی هەبیت ، ئەوە تەنها لە لایەن خودا وە یە ..!!

لە (ابن القیم ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : (نهینی پشت بەستن و راست وحەقیقتی ئەوەیە كە پیویست یان باوەرپیكردنە بە (خوای گەورە ) بە تەنها ، راستەخۆ زەرەرو زیان روونادات مەگەر لە گەل هۆكارە كانەوە بەتالی دل دەروونی لە باوەر پیكرن و ئەعتماد كردن لە سەریان ئەوەش رووكنیكە ) . [١٨]

وە ئەوش جیاوازی نیوان پەشت بەستن بە (خوای گەورە ) راست و حەقیقەتی ، وە پشت بەستن تەنها دەربری بە زمان ، ئەوەش كە هۆكارە كان نەمان مانای وانیە هیچ شتیك لە پشت بەستن راستە و حقیقەتە ، چونكە دەزانی كە ئەو خودایەی پشتی پی دەبەستیت و ئەعتمادی لەسەر دەمینیتەوە و بوونی هەیە.

وە سەربارەت بەوەی كە بانگوازی یان پشت بەستن دەردەبی بە زمانی ، ئەوا بەیك دە كەویت لە گەل هۆكارە كانی پشت بەست ، ئەوەش ئەوە دە گەینی كە لاوازی پشت بەستنە بە خوا وابەستەی یان ئەعتمادی لەسەری ..!

بەلی حەقیقەت و راستی ئەم كارە ، ئەوەی كە پشت بەستن حالیكە لە كۆمەلیك شت دروست دەبیت كە ئەمانە:

[١٨] - ابن القيم في الفوائد (٨٧).

یەکەم : ناسینی خوای گەورە و سیفاتەکانی ،بی گومان ئەو ناسینەی خوا یەکەم پلە یە کە بەندە پی دەنیتە پیگەی پشت بەستن بە خوا تەنها .

دووەم : جیگیر کردنی پشت بەستن لە هۆکارو دەرئەنجامەکانی ، واتا : هەر کەسی نەری یان نهی لە هۆکارو دەرئەنجامەکانی بکات ئەوا پشت بەستنەکەی لاوازە شتیکی تیکەل بووە ، وە ئەوە وایە کە ئاو نان و سەرفر نەکات ،بلیت بشت بەخوا دەبەستم ، بە لام نەری هۆکارە کانی پشت بەستنی کردوو ، چونکە ئە گەر ئاوا نان و خوردن نەخوات ناژیت ،یان ئەگەر سەفر نەکات ناجیتە بۆ ریگا یان بۆ حەجی مالی خوا ، دەبیت هۆکارە ئەنجام بدا ئینجا پشت بەخوا بە بەستیت ، بی گومان وە هەموو ئەو هۆکارانەی کە هەن لە ژیانی رۆژانە ماندا ،زەوی دەکلی دانەویلە دەچینیت ئاوی دەدی ئینجا دەلیت پپشت بە خوا ،یان نەخۆشی دەبیت دەرمان دواو بچیتە لای پزیشك بۆ چارەسەر کردن ئینجا دەلیت پشت بەخوا ،ئەگەر چارە سەر نەکریت ئەوا ژیانت لە دەست دەدیت و ،ئەوانەو چەندین شتی تر لە هۆکارە کانی (التوکل ) یان پشت بەستن بە(خوای بەرزو بلندە).

سی یەم: خشوع قول بوونەوە و جیگیر کردنی (دڵ ) دەروون لە پیگەی یەکتایی پشت بەستن بە خوای گەورە ، بەلی پشت بەستنی هیچ کەس نایەتە دی و راست و دورست نابیت کە یەکتاپەرستیەکەی راست و دروست و تەواو نەبیت ، بەلکو حقیقەتی پشت بەستن بریتیە لە یەکتایی (دڵ) هیچ شتیك تیکەل نەبیت تەواوو راست و دروست بیت .

چوارەم : متمانەی (دڵ) بە( خوای گەورە) ، یان خۆ دانە پال (خوای گەورە ) وە ئەوە وایە مندالیك شیری مەمکی دایکی دەخوات ،ئەو منداله هیچ کەسیك ناناسی جگە لە و دایکە چونکە هیچ جیگەیەی بۆ سووکنایی نیە و بیناسیتەوە جگە لەمکی دایکی نەبیت ئەوەش سووکنە یەکی ئارامە بۆ مندالە کە هەر بۆیە دەبیت لە هەموو ناخۆشی خۆشیەك دا بگەرینەوە بۆ لای سووکنایی (دڵ ) تشبیهـ نەبیت ئەویش (خوای گەورە بەرزو بلند ) بۆیە دەبیت دڵ وابەستی خوای گەورە بیت .

پیینچەم : گومانی باش بردن بە (خوای گەورە ) بە ئەندازەی ئەوەی کە دوعاو پارانەوەی لی دەکەیت دەبیت ئەواش بشت بە خوای گەورە ببەستیت ،راستی گومانی باش بردن بە خوا کەسە بانگ دەکات بۆ پشت بەستن بەخوا ،چونکە پشت بەستن بە کەسیك وینە ناکریت ئەگەر گومانی خراپی بە خوا هەبیت .

بی گومان پیغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم ) یەكیك بوو لە مەزن ترینی ئەوكەسانەی كە پشت بە خوای گەورە دەبەست ،یان هیچ كەسیك بە قەد پیغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم ) پشتی بە خوا نەبەستا ، وە لە گەل ئەوەش هۆكارە كانی پشت بەستنی وەردەگرت لە كاتەكان و هەلویستەكان و رووداوەكان دا ،چونكە بۆ ئەوەی كە روون بكاتەوە بۆ ئۆمەتەكەی ، كە وەرگرتنی هۆكارە كانی پشت بەستن پیچەوانەی (التوكل ) یان پشت بەستن نیە ، چونكە ئەوە فرتەتیكی سروشتی هەموو ئادەمیزادیكە كە دەبیت رەچاوی هۆكارە كانی بكات لە ژیاندا ..!!

بەلی پیغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم ) بۆ خۆپاراستنی خۆی لە جەنگ دا دوو زرییۆشی یان درعی پۆشیوە ، واتە: دوو زرییۆش لەبەر دەكرد یەكیكیان لەسەر یەكیكیانی لەبەر دە كرد لەسەر یەك دا .

لە (سائب كوری زید ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : ((**أنَّ رسولَ اللَّه صلَّى اللَّهُ علَيهِ وسلَّمَ ظاهرَ يومَ أُحُدٍ بينَ دِرعَينِ** )) .[19] واتە: پیغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم ) لە رۆژی ئوحوودا ، دوو زرییۆشی بە یەكەوە كۆكردبووەوە و یەكیكیانی كردبوو بەسەر ئەوی تریان دا بۆ یارمەتی دانی یەكیتر..!!

وەلە لە كاتی تح كردنی شاری مككە پیغەمبەری خوا خودەیەكی لەسەری كرد بووە ،واتە كلاویكی ئاسنی سەربازی لە سەری كردبوو لە رۆژی فتح كردنی شاری مككە دا .

لە ( ئەنسی كوری مالك ) دەلیت : ((**أنَّ النبيَّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الفَتْحِ وعلَى رَأْسِهِ المِغْفَرُ**)).[20] واتە : پیغەمبەری خوا(صلى الله علیه وسلم ) لەرۆژی فتحی یان چوونە ژوورەوی شاری مككە لە سەری سەری كلاویكی ئاسنی سەربازی لەسەر بوو .

ووشە ی (المغفر) واتە : خوودە یان كلاوی ئاسنی سەر بازی .

---

[19] سنن ابي داود برقم (٢٥٩٠).
[20] - صحيح البخاري برقم (١٧٤٩).



وە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە رۆژی کۆچ کردنی دا ، دوای ری نیشادەریکی کرد، بۆ ئەوەی لە ریگادا وون نەبن ریگایان بۆ ئاسان بیت بۆ کۆچ کردن ، ئەوە بوو ری نیشان دەریکیان لە گەل دا بوو بۆ بەچاو روونیان لە ریگادا ، وە کاتیکیش لە مال دەر چوون کەس پی نەزانی ،خەلکی بی ئاگا بوون لە دەرچوونیان ، وە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) ریگا کەی خۆی گۆری بۆ ئەوەی زیانی پی نەگات ،وە هەموو جاریك ..!!واتە: دەبیت لە گەل پشت بە ستن هۆکارە کانی ئەنجام بدەی وە پشت و پەنای تەواویشت بە خوای گەورە بیت ..!!

هەموو ئەم بابەتانە پەیوەندی بەوەرگرتنی هۆکارە کانەوە هەیە ، ئەوەش بۆ زانینی ئومەتەکەی کە بۆ وەرگرتنی هۆکارە کان ئەوشتانەی دیتەریگایان کە زۆر گرینگە وەر گرتنی هۆکارە کان ، ، کە ئەمەش شتیکی حەتمییە بو موسلمان کە پشت بەستن لەسەری .

وەلە (عمری کوری خەتاب ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : لە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( لو أنَّكم كنتُم توَكلونَ علَى اللهِ حقَّ توَكلِه لرزقتُم كما يرزقُ الطَّيرُ تغدو خماصًا وتروحُ بطانًا )) .[21]

واتە: ئەگەر بەراستی پشت بە خوا بەستن خوا رۆزیتان دەدات وەك چۆن رۆزی بالندە دەدات بەیانیان بە برسیتی دەردەچی لە هیلانە کەی و ئیواران بە تیری دە گەریتەوە ..!!

وە ئەم فەرموودەیە بیانیکی زۆر گرینگە بۆ ئەوەی هۆکارە کان وەرگرین ،چونکە بالندە تکلیفی کراوە دەبیت رزق رۆزی بۆ خۆی پیدا کات ، وە نابیت لە هیلانەکەی ی دا مبینیتەوە بۆ ئەوەی رزق رۆزی بۆ بیتە خوارەوە چاوەری رزق بکات ، بە لکو دەبیت دەربچیت بە بیانیان ،بە برسیەتی بۆ گەران بەدوای رزق دا ،وە لەسەر خوای گەورەش ئەوەیە کە رزق رۆزی بۆ دابین بکات ، وە دواتر دەگەریتەوە هیلانەکەی بە تیرو پەری ..!! وە بۆ هەموو موسلمانیك دەبیت ئاگاداری هۆکارەکانی بیت ،چونکە ئەو هۆکارانە پەسەندە شرعیە ، وەهەندیك لە خەلکی ریشوە دەدن بە فەرمانبەرەکانی دەولە ت بۆ مصلەحەتی خۆیان ،وە دەلین : ئەوە لە بابەتی (التوكل ) یان پشت بەستنە ، ویان فیل کردنی قوتابی لە اتی تاقی کردنەوە دا ،ئەویش دەلین : لەبابەتی (التوكل ) یان پشت بەستنە، وە ئەوانە هیچیان لە (التوكل ) یان پشت بەستن نینە ،بەلکو پیچەوانەی دژی (التوكل ) یان پشت بەستنە ،چونکە (التوكل ) بە خوا دەبیت حەقی تەواوی پی بدەیت ، نابیت پیچەوانە و دژی شەرع بیت ..!!

[21] - سنن الترمذي برقم (٢٣٤٤).

وه ك له پشدا باسامان كرد له (التوكل ) یان پشت بەستن دەبیت به وەرگرتنی هۆكاره كان ئەوا پشت بەستنی تەواوه ، بەلام وەر نەگرتنی هۆكاروه ئەوا ده بیته (التواكل ) یان پشت بەستووان ، وه ئەمەش هیچ له ئاینی (خوای گەوره ) دانیه شتیك به ناوی (التواكل ) یان پشت بەستووان ..!!

وه كو دەلین : ئەو كەسەی واز یان تركی (التوكل ) پشت بەستن بكات ، ئەوا زیانی له یەك خوا پەرستی داوه ، وه هەر كەسیك واز یان تركی هۆكاره كان بكات ئەوا زیانی له هۆشمەندی خۆی یان عەقلی خۆی داوه ..!!

(التواكل ) یان پشت بەستووان ئەوه یەكیك له هۆكاره كان ی لاوازی ئۆمەت ، وەك ئەوه وایه كه پیاویك له ماله كەیدا دانیشیت و چاوەری رزق رۆزی بكات ، كه چی هیچ جوولەیەكیش نەكات بۆ بەدەستهینانی رزق رۆزی بی خەم له ماله كەی بی جوو له دانیشیت ،وه دەلی : من پشت بەستوومه به (خوای گەوره ) .

وه خەلكی چاوەری ئەو دەكەن كەسەر كەویت به سەر دوژمانی دا ، وه ناگرینەوه بۆ علیم زاسنت و بەلینه كانیان .

له ( كوری عباس ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : (( ان أهْلَ اليَمَنِ يَحُجُّونَ ولَا يَتَزَوَّدُونَ، ويقولونَ: نَحْنُ المُتَوَكِّلُونَ، فَإِذَا قَدِمُوا مَكَّةَ سَأَلُوا النَّاسَ، فأنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى:﴿وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى﴾ . [22] . [23]

واته: خەلیكی وەلاتی یمن دادەنیشتن له مالەوه هیچ كارو كاسبیه كیان نه دەكرد بۆ زرق زیاد كردن و پەیدا كردن ، ئەوانیش هیچ رزقیكیان بۆ زیاد نەده بوو ..؟! ده یان ووت : پەشت وپەنامان به خوای گەوره هەیه ..!! كاتیك هاتنه شاری مككه پرسیاریان لەخەلكی كرد . وه خوای گەوره ئەم ئایەتەی ادا بەزاند كه دەفەرمووی : ﴿وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى﴾ واته : بی گومان هەر خیرو چاكەیەك ئەنجام بدەن خوای گەوره پی دەزانیت وه ئاگاداره لی ، بەردەوام هەولبدەن كه زەخیره بكەن ،بی گومان چاكترین زخیرەش تەقواو پاریزگاریه ..!!

[22] - سورة البقرة (١٩٧).
[23] صحيح البخاري برقم (١٥٢٣).



باش بروانە چۆن (خوای گەورە)  نەکۆلی لیدەکات ئەوانەی کە پشت دەبەستن بە خوا بی هۆکارە کانیەوە ، ئەوانە هیچ لە رزق رۆزی خیر چاکە یان بۆ زیاد نابیت ،بۆ بەدەست هینان و یارمەتی  پیداویستیە کانی ژیانی رۆژانەیان وە ك رزق و رۆزی شتە پیویست کان ..!!

وە مەبەست ئەوە نیە کە ئادەمیزاد بارگرانی بخاتە سەر نفسی خۆی ،بە وەرگرتنی هۆکارە کان  وە تکلیفی لەسەربیت  لە توانای دانەبیت ،بەلکو هەندیك جار هۆکارە کان ئاسانە لاوازە ، وە ك بەلگەی چیرۆکی (مریم ) کە (خوای گەورە ) فەرمانی پی کرد قەدی دارە خورماکە بە هەژینی و بۆ ئەوەی کە خوماکان بیتە خوارەوە ،  هەروە ك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا﴾ .[٢٤]

واتە: ئەو دار خورمایەی کە پالت پیوەداوە  کەمیك رایوەشینە یان بە هەژینە خورمای تازە و بی گەیشتووت بەسەر دا دەبارینیت ..!!

وەهەندیك لە رۆژئاواکان ئەلین : چۆن  ..؟!  ئەو  ئافەرتە نەخۆشە دوو گیانە ، توانی دارخورما بەهیزە کە  بەرایوەشینی یان بەهەژینی  خورمای لی بیتە خوارەوە ..؟!

وە ئیمەش دەلین : بەلی .  ئەوا خوای گەورە یە کە فیرمان دە کات لە چیرۆکی (مریم ) بۆ دەست گرتن بە هۆکارە کان ، چونکە چیرۆکی ئەو ئافرەتە گرنگترین لە دەست گرتن یان وەر گرتنی هۆکارە کانی (التوكل) ، وە ئەگەر ئەو هۆکارانە لاواز بوونیایە ، چونکە ئەو ئافرەتە ئافرەتیکی چاکە کار بووە ، وەهیچ هۆکاریك نەبووە لە کاتەی دا تەنها ئەوە نەبیت کاریکی لاواز بووە ،ئەویش هەژینی دارخورمابووە ، وە بەلام کاتیك کە متمانە و پشت بەستن بە خوا هەیە دەبیت مافی متمانەو پشت بەستنە کەت بدەی ، وە کاریك بە هۆکاری لاوازیە کەیەوە ، ئەوا (خوای گەورە ) پیت دەبەخشیت  ئەوەی  کە دە تەویت مەبلت لەیەتی .

خۆ (خوای گەورە ) لە توانا دا بوو خورماکە بەرداتە خوارەوە بی هۆکاری هەژینەکە یان راهەژینەکە ، بەلام هۆکاری هەژینەکە ئەو سوونەتیکی گەردوونیە  بە فرمانی کردنی هەژینی دار خورما ، بۆ هەموو ئادەمیزادیك دەبیت هۆکاریك هەبیت ،وە یەقین متمانەی تەواویشت هەبی ،  بە پشت بەستن یان (التوكل ) بە(خوای بەرز بلند ) ، وە ئەگەر ئادەمیزاد هۆکارەکان ئەنجام نەدا ئەوا ممکینە ،بەلام نابیت هۆکارە گەورە کان بەهیزە کان لەبیر بکات ، ئەوکاتەی کە دوای پارانەوەی لە (خوی گەورە ) دە کەین بۆ فەریاکەوتن  و هانا بۆ بردن لە کاتی تەنگانە دا ..!!

[٢٤] - سورة مريم (٢٥).

# حكم وبرياری شەرعی لە سەر پشت بەستن يان (التوكل )

بەلی پشت بەستن بە (خوای بەرز بلند ) واجبە لە گەورە ترين واجبە كان .

لە (ابن تيميه ) – رەحمەتی خوا لی بيت – كە (التوكل ) يان پشت پی بەستن بە خوای گەورە واجبە لە گەورە ترين واجبە كان دا ، هەروەكو ئەخلاص يان نيەت پاكی بۆ (خوای گەورە) واجبە ، وەكو ئەوی كە (خوای گەورە ) فەرمانی پی كردووين جگە لە ئايەتيكی گەورە تر كە فەرمانی پيڕ كردووين بۆ دست نويژ شووشتن و خۆ شووشتنو جنابە هەلگرتن ، وە قەدەغەشی كرووين لە پشت بە ستن جگە لە (خوای بەرزو بلند ) .[٢٥]

بەلام پشت پی بەستن يان (التوكل ) مەرجی باوەرو ئيمانە ،بۆ تيگەيشتن لە ئايەتەكانی (خوای گەورە ) كە دەفەرموويت ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ .[٢٦] واتا:دەبيت بە تەواوی پشت بە خوا ببەستن ئەگەر ئيوە ئيماندارن ..!! بی گومان ئەوەی رەتی (التوكل ) يان پشت بەستن بكاتەوە ئەوا رەتی باوەر و ئيمان دە كاتەوە ..؟!

وە (التوكل ) يان پشت بەستن يەكيكە لە بنچينەو بناغەی يەك خواپەرستی يان توحيد ئەلوهيە ، هەر وەك بەلگەی ئايەتيكی قورئانی پيرۆز لەسەر كە خوای گەورە دەفەرموويت ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ .[٢٧]

وە گەران بە دوای ئايەتەكانی قورئانی پيرۆز دا لە سەر (التوكل ) يان پشت بەستن فەزلی زۆرە ،وە لفظي (التوكل ) لە قورئانی پيرۆز دا (٤٢) جار هاتوو لە بابەتی (التوكل ) يان پشت بەستن ،وە هاتووە بە لفظي تاك و كۆدا ،وە لفظي رابردوو يان داهاتووە وەيان فەرمان كردن ، وە هەر هەمووی هاتووە بەمانای پال پشتی يان پشت بەستن و متمانە كردن و ئەعتماد بە (خوای گەورە ) بۆ راسپاردە كردنی نفسی خۆی بە فەرمانەكانی بە (خوای گەورە ) ..!!

[٢٥] - ابن تيمية في مجموع الفتاوى (٧/ ١٦).
[٢٦] - سورة المائدة (٢٣).
[٢٧] -سورة الفاتحة (٥) .

أ–فەرمانی (خوای گەورە ) بە پێغەمبەرە کەی (صلى الله عليەوسلم ) بە شت بەستن پی :

بەلی (خوای گەورە ) تایبەت بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمانی کردووە بە (التوکل ) یان پشت بەستن پی ،کە لە چەندین ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دا هاتووە ..

هەروە ك (خوای گەورە ) دەفەرموویت ﴿فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّكَ عَلَى الْحَقِّ الْمُبِينِ﴾ .[28]

واتا : ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم ) کەواتە تۆ پشت بەخوا ببستە ،بەراستی تۆ لەسەر حەق و راستیەکی ئاشکرایت ..!!

وە (خوای گەورە ) دەفەرموویت ﴿فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ﴾ .[29]

واتا:دەی کەوا بوو هەر ئەو زاتە بپەرستن هەر پشت بەو ببەرستن.

وەهەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِ وَكَفَى بِهِ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا﴾ .[30]

واتا: تۆ ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم ) پشت ببەستە بەو زاتەی کە هەمیشە زیندووە و هەرگیز نامریت ، بەردەوام تەسبیحات و سوپاس و ساتیشی بکە ، ئەوەندە بەسە بۆ ئەو زاتە کە بەهەموو گوناهو تاوانی بەندەکانی بە ئاگایە و هیچ شتیکی لی وون نابیت ..!!

[28]- سورة النمل (٧٩) .
[29]-سورة هود (١٢٣).
[30]- سورة الفرقان (٥٨) .





وە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾.[٣١]

واتا: کەوا بوو ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم ) بە هۆی رەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هیمن بویت لە گەلیاندا ، خۆ ئەگەر تورەو قسە رەق و بی بەزەیی بوویایە ، ئەوە هەموو لە دەورت بلاوەیان دەکرد ، کەواتە چاوپۆشیان لیبکە و لییان ببورە و داوای لی خۆش بوونیان بۆ بکە ، لە کارو پیشهاتدا پرس و رایان پی بکە ، (دوای مەشوورەت پرس را )، ئەگەر بریارتدا کاریك ئەنجام بدەیت ئەنجامی بدەو پشت بە خوا ببەستە ،چونکە بەراستی خوا ئەوانەی خۆشدەویت کە پشتی پیدە بەستن ..!!

وە (خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾.[٣٢]

واتا: جا ئگەر ئەوانە لە گەل ئەو هەموو دلسۆزیی و میهرەبانیە ی تۆدا ، هەر پشت هەلکەن و گویت بۆ نەگرن ، ئەوە ئیتر تۆ بلی : من خوا بەسە یارو یاوەرم بیت ، کەپشتگیرو یاریدەدەرم بیت ، هیچ خوایەك نیە جگە لەو زاتە ،هەر پشت بەو دەبەستم ،ئەو زاتەش پەروەردگاری عەرشی گەورە یە ..!!

وە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿قُلْ هُوَ الرَّحْمَنُ آمَنَّا بِهِ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِي ضَلَالٍ﴾ .

واتا : هەروەها ئەی محمد (صلی الله علیەو سلم ) بلی: ئیمە خوای میهرەبانمان هەیە و باوەری پتەومان پی یەتی و پشت و پەنامان هەر ئەوە ، جا ئیتر رۆژیك دیت کە بەروونی بۆتان دەردەکەویت کی لە گومرایی ئاشکرادا گیری خواردووە سەری لی شیواوە ..!!

بی گومان فەرمانی (خوای بەرزو بلند ) بە پیەمبەرە کەی (صلی الله علیه وسلم ) فەرمان کردنە بە هەموو ئۆمەتەکەی ..!!

[٣١] - سورة ال عمران (١٥٩) .
[٣٢] - سورة التوبة (١٢٩) .

### ب=فەرمانی (خوای گەور ) بۆ ئیمانداران بە پەرستنی خوای گەورە وە پشت بەستن پی :

کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾.[٣٣]

واتا: دەبا ئیمانداران هەر پشت بە خوا ببەستن ..!!

### ج= وسفکردنی ئیمانداران بەوەی کە پشت بە ( پەروەردگاریان) دەبەستن :

بی گومان پشت بەستن بە (خوای بەرزو بلند ) ئەوە سیفەتیکە لە سیفەتەکانی پەرستنی (الرحمن ) ، وە شعارو رەمزو نیشانەی ئیماندارە ، بەوەی لەو کەسانی تری جیا دەکریتەوە ، وە نیشانەیکی یان هیمایەکی گرنیکی ئەهلی ئیمان و باوەرە ..!!

هەروەک (خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ .[٣٤]

واتا: بی گۆمان ئیمانداری راستەقینە تەنها ئەوانەن : (یەکەم) کە کاتیك ناوی خوا برا ،ئەوا دڵە کانیان دەترسیت و دەهەژیت ، (دووەم ) کاتیکیش ئایەت و فەرمانەکانی ئیمەیان بەسەر دا بخوینریتەوە ئەوە ئیمان و باوەریان زیادە دەکات ، (سی یەم ) لە هەموو کارو باریکیشیان دا هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن ..!!

وە لە (ابن کثیر ) – رەحمەتی خوای لەسەر بیت – لە راڤەی ئەم ئایەتەدا دەلیت : ﴿وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ ئیمانداران خۆیان بە پەروەردگاریان دەسپیرن ،واتە : بەتەمای کەسی تر نینە بیجگە لە (الله ) چونکە تەنها مەبەستیا(الله) کە هانا بۆی ببەن ، هانا نابەنە بەر کەس بیجگە لەو زاتە ..!! داوای یارمەتی و پیویستەیەکانیان هەر لەو زاتە دەکەن ..!! دلیان بە و (الله ) یە خۆشە دەزانن مەیل و مەرامی لە هەرشتیك بوبیت بووە ، مەیل و مرامیشی لە هەرشتیك نە بوو بیت نەبووە ، هەر (الله ) خۆی دەستەلاتدارە لە ملك کە کانی هیچ هاوبەش و شریکی نیە ، کەس دەستی وەر ناداتە فەرمانی وە لیپرسینەوەی خیرایە ..!! .[٣٥] هەر بۆیە خۆ بە (الله ) سپاردن کۆی ئیمان و باوەرە ..!!

### د– وە بیر هینانەوەی هەندیك نموونەی پشت پی بەستنی پیغەمبەران (علیه السلام ):

[٣٣] - سورة ال عمران (١٢٢).
[٣٤] - سورة الانفال (٢) .
[٣٥] - ابن کثیر في تفسیر القران عظیم (٣٧٩/٢) .

– فەرمانی خوای گەورە ئەوە یە کە بەوەرگرتنی نموونەیەکی باش و چاك و پیشەنگ وە (ابراهیم ) – علیه السلام _ و ئەوانەی شوینەکەوتەی (ابراهیم ) بوون ، بۆ ئیمانداران ، دەبیت وەك (ابراهیم ) پیشەنگ بن لە چاکە کردن و نموونەی ئیمانداری باش بن ، کە (خوای گەورە) دەفەرموویت : ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ﴾ . [٣٦] واتا: ئەی ئیمانداران ، بەراستی لە (ابراهیم ) و ئەوانەی کە لەگەلیدا بوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتەوە بەر چاو ..!!وە هەروە ها (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ . [٣٧] واتا: ئینجا ووتی: ئەی پەروەردگارا ، هەر پشتمان بە تۆ بەستووە و هەر بۆ لای تۆش گەراینەتەوە ، سەر ئەنجامیش هە ر بۆای تۆیە ..!!

ئەوە بوو کە (ابراهیم ) گەلە کەی لە سەر کۆ بوونەوە بۆ ئەوەی بیسووتینن ئەویش بە کۆ کردنەوەی زۆری داری سووتینراوە ..!!

ئەوە بوو هەندیك لە بت پەرستان ووتیان: با (ابراهیم ) چاك بسوتیت ئەگەر ئیوە یارمەتی خوا کانی خۆتان دەدەن یان ئەو کارە دە کەن ، وە دارو سووتەمەنیەکی زۆریان کۆکردەوە هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت ﴿قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانْصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ﴾ . [٣٨]

(السدی ) دەلیت : هە تا وای لیهات ئە گەر ژنیك نەخۆش بکەوتایە نەزری دە کرد لەسەر خۆی ئەگەر چاك بووەوە لەو نەخۆشیە کۆلیك دار ببات بۆ سوتاندنی (ابراهیم ) ..!!. [٣٩]

ئەوە بوو هەموو ئەو دارو سوتەمەنیە یان لە چالیکدا کۆ کردەوەو ئاگریان تی بەردا بلیسەو گلپەی زۆری گەورەی لی بەرزدەبووەوە و ، هەر گیز ئاگری وەها بەم شیوەیە نەکرا بۆیەوە ، ئینجا (ابراهیم ) یان خستە ناو مەنجەنیق ،بە ئاماژەی پیاویکی دەشتەکی فارس کە پی دەووتریت (کورد) یان (الاکراد) هەروەك بە پیاوی دەشتە کی عەرەب دەووتریت (الاعراب) بە پیاوی دەشتە کی رۆم دەووتریت (ئەحباش) .کاتیك (ابراهیم ) چووە ناو مەنجە نیقەو یان ناو ئاگرە کەوە ووتی (خسبی الله ونعم والوکیل ) واتە : خوامان هەبیت بەسمانە هەر ئەو پشت و پەنامە ..!!

[٣٦] - سورة الممحنة (٤) .
[٣٧] - سورة الممحنة (٤) .
[٣٨] - سورة الانبیاء (٦٨) .
[٣٩] ابن کثیر في تفسیر القران عظیم (٢٤٧/٣).





هەوره ك لە فەرموودەیەكی (كوری عباس ) – خوالی را زی بیت – دەلیت: (حسبنا الله ونعم والوكيل ) ئەوە بوو كاتیك (ابراهیم ) خرایە ناو ئاگر ئەمە ی ووت : (حسبنا الله ونعم والوكيل ) واتە: خوامان هەبیت بەسمانە ، هەر ئەویش پشت و پەنامە ..!! .[40]

✍– وە ئەوەش موسی (عليه السلام ) ئەوە بوو پشت بەستوو بوو بە (خوای گەورە ) ،وە فەرمانی بە گەلە كەی خۆی كرد كە پشت و پە نا تەنها بە( خوای گەورە ) هەبیت كە (خوای گەورە ) دەفەر موویت : ﴿وَقَالَ مُوسَى يَا قَوْمِ إِنْ كُنْتُمْ آَمَنْتُمْ بِاللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُسْلِمِينَ﴾ .[41] واتا: موسی بە قەومەكەی ووت : ئەی قەوم و هۆزەكەم ، ئەگەر ئیوە بەراستی باوەرتان بە خوا هیناوە ، ئەوە ئیتر پشت بەو ببەستن ئەگەر موسلمان و ملكەچن ..!!

وە (شیخ سلیمان كوری عبدالله كوری محمدكوری وهاب ) دەلیت : (واتای ئەم ئایەتە ئەوەیە ك (موسی) فەرمانی بە هۆزو گەلە كەی كرد ، كە بچنە ناو زەویەكی پیرۆز ، بە وەی كە (خوای گەورە) بۆی نوو سی بوون ، بەهیچ شیوەیەك دوو دل و رارا نەبن لەسەر ئەوەی بترسن یان پاشە كشە بكەن لە بەر ئەوەی بە هیزو دەسەلاتن ، بەلكو بەردەوام بن بەرەوە پیشەوە بچن ، نە بترسن ، نە لایان بترسن ، بەهیچ شیوەیەك لیان بەمەترسن ، پشت و ببەستن بە خوا لەوەی كە شكستان پی بهینن و ،وە پشت بەسراوە بن بەو بەلینانەی خوای گەورە ئەگەر ئیوە ئیماندارن ) .[42]

---

[40] - صحيح البخاري برقم (٤٥٦٣).
[41] سورة يونس (٨٤) .
[42] - تيسير العزيز الحميد ص(٤٣٨).

✍ – وه پێغەمبەری ئازیزمان (صلى الله عليه وسلم ) لە گەل هاوەلە بەریزە کانی (خوا لی یان رازی بیت ) ئەوانە نموونەی پیشەنگی چاكە كاران بوون ، ئەوە بوو لە غەزای ئوحودا پشت و پەنایان بە خوای گەورە بەست ، كە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ .[43] واتا: ئەوانەی كە خەلكی (باوەرە لاواز ) پییان دەلین : بەراستی خەلكی بی باوەر خونەناس خۆیان بۆ ئیوە كۆ كردۆتەوە و خۆیان بۆ ئیوە مەلاس داوە ، لییان بترسن خۆتان تووشی بەلا و مەكەن ، بەلام ئەوان واتە: ئیمانداران بەو پروپاگەندەیە باوەریان زیاتر دامەزراوە ، ووتیان خوامان بەسە كە یاریدەدەرو یارمەتیدەریكی چاكە و باشە بی هاوتایە ..!!

هەروەك (كوری عباس ) دەلیت : (حسبنا الله ونعم الوكيل ) دەلیت : ابراهيم (عليه السلام ) ووتی : لە كاتی فریاندایە ناو ئاگری مەنجەنیقە كە ،وە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەی ووت : كە (خوای گەورە ) دەفەرموویت لە سەر زاری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ .[44]
واتا: ئەوانەی كە خەلكی (باوەرە لاواز ) پییان دەلین : بەراستی خەلكی بی باوەر خونەناس خۆیان بۆ ئیوە كۆ كردۆتەوە و خۆیان بۆ ئیوە مەلاس داوە ، لییان بترسن خۆتان تووشی بەلا و مەكەن ، بەلام ئەوان واتە: ئیمانداران بەو پروپاگەندەیە باوەریان زیاتر دامەزراوە ، ووتیان خوامان بەسە كە یاریدەدەرو یارمەتیدەریكی چاكە و باشە بی هاوتایە ..!!

ئەوەیە كە پشت بەستنی ئیمانداران بە (خوای گەورە ) لە كاتیك دا یە كە ژمارەی دوژمنان چەندی جار لە ئیمانداران زیاترە ،وە خەلك لەم كاتە دا ترس لەدلی دا دروست دەبیت ،ئەوەش دەبیت پشت بە خوا ببەستین كاتیك لەبەرامبەر زۆری دوژمن ترس دروست بوو ، هەموو كات پشت بە خوا دەبەستین ..!!

چونكە ئەو زاتە نزیكە لیمان بۆ وەلامدانەوە پشت و پەنا گرتن بەو زاتە ، كە بلین: خوامان هەبی بەسمانە بۆ پەرستن و پشت پی بەستن پی ..!!

---
[43] - سورة ال عمران (١٧٣).
[44] - صحيح البخاري برقم (٤٥٦٣) .

هەروەها نیشاندانی مەنزلی پشت پی بەستن و فەزل و گەورەیی ، ئەوەش كە ئەو پیگانەیە لە باسی كردنی پشت بەستندا تی دا باسی دەكەین ، ئەمانەی خوارە وە پیگەكانی پشت بەستنن :

## ١–فەرمان كردبە پشت بەستن لە پیگەی پەرستندا :

كە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ﴾ . [٤٥] واتا: دەی كەوا بوو هەر ئەو زاتە بپەرستن و هەر پشت بەو ببەستن ..!! ئەوە ش فەرمانی (خوای گەورە یە ) لە سەر پیغەمبەرە كەی (صلى الله عليه وسلم ) وە لەسەر ئیمانداران بە گشتی بەپەرستنی و پشت بەستن پی لەم پیگەیەك دا .

وە (خوای گەورە ) بە پیغەمبەرەكەی دەفەرموویت : ﴿وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلًا﴾. [٤٦] واتا: بەلكو تەنها شوینی ئەو رینموونیانە بكەوە كە لەلایەن پەروەردگارتەوە بەنیگا بۆت رەوانە دەكریت ، بەراستی خوا هەمیشە ئاگادارە بەو كردەوانەی كە ئەنجامی دەدەن ..!! هەمیشە و بەردەوام پشت بە خوا ببەستە ،تەنها خوا بەسە كە پشتوان و یاریدەدەربیت ..!!لەدوای ئەوە فەرمان بە پەرستن و شویكەوتووی ئەو پەیمامە بن واتە: وەحی نیگا كە لە لایەن (خوای گەورە ) فەرمانت بەسەر دراوە ، وەفەرمان دە كات كەپشت بە خوا ببەستە وە فەرمانە لەسە رئۆمەتە كەی لە دوای ئەو دا تاكو رۆژی دوای دا یان قیامەت دا ، چونكە بنچینەی پیغەمبەرایەتی بانگەوازی گەیاندنی پەیامەكەی بۆ هەر ئۆمەتیك پیگە ی تایبەتی نەبووە لەسەری تەنها هەر هەموویان بانگ كردنیان بە پەرستنی خوای گەورە و پشت بەستن پی ی ..!!

[٤٥] -سورة هود (١٢٣).
[٤٦] - سورة الاحزاب (٢-٣).

## ٢-فەرمان کردن بە پشت بەستن لە پیگەی بانگەوازی خوا دا :

(خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ [٤٧]. واتا: جا ئەگەر ئەوانە لە گەل ئەو هەموو دلسۆزيى و ميهرەبانيەس تۆ دا ، هەر پشت هەلکەن و گويت بۆ نەگرن ،ئەوە ئيتر تۆ بلی : من خوام بەسە ياروەرم بيت ، کە پشگيرو ياريدە دەرم بيت ، هيچ خوايەك نيە جگە لەو ، هەر پشت بەو دەبەستم ،ئەو زاتەش پەروەردگاری عەرشی گەورەيە ..!!

ئەو کەسەی کە کۆتايیى بە هيزو دەست هەلات و پاشايەتی گەورە ی شکۆمەندی پيگەی دە هينيت ، وە پيويستە بەوەی کە کی پەنای بۆ بردووە ،وە بەکريان بەسە بۆ بەرگری کردن  لە خراپە کاری ، تەنها (خوای گەورە ) دەتپاريزی لە هەموو شتيك نە دەست هەلات و هيزی هيچ دورست کراويکی خۆی ..!!

هەروە ك (نوح ) – عليە السلام – پشتی بە خوای گەورە بەست لە بانگەوازيە کەی دا  ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ نُوحٍ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ إِنْ كَانَ كَبُرَ عَلَيْكُمْ مَقَامِي وَتَذْكِيرِي بِآيَاتِ اللَّهِ فَعَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْتُ فَأَجْمِعُوا أَمْرَكُمْ وَشُرَكَاءَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّةً ثُمَّ اقْضُوا إِلَيَّ وَلَا تُنْظِرُونِ﴾ . [٤٨] واتا: ئەی پيغەمبەری خوا (صلی الله عليه وسلم ) بەسەر هاتوو هەوالی (نوح) – عليە السلام – بەسەر ئەو خەلکە دا بخوينەوە ، کاتيك بە قەومەکەی خۆی ووت : ئەی قەوم و کەسم، ئەگەر ئيوە سەغلەتن ،بە مانەوەی من لەناو تاندا و ياد خستنەوەی ئايەتەکانی خوای گەور ی لاتان گرانە ئەوە دلنيابن کە من کۆل نادەم ..!! پشتم بە خوا بەستووە لەو کارەمدا ئيتر ئيوە چيتان لەدەست ديت دريغی مەکەن ،خۆتان و بتە کانتان و هاوبيرو باوەرکانتان بکەونە خۆ رای خۆتان کۆبکەنەوە ، پاشان بە ئاشکرا چی دەکەن بيکەن ،هەرچيان لە دەست ديت دژ بە من ئەنجامی بدەن منەتان نەبيت  ،مۆلەتم مەدەن ..!!

لەدوای بانگەوازيە کی دريژ خەياندا ،وە مانەوەی (نوح ) – عليە السلام بە چەندين سالی دريژەی خەياند لە بانگەوازيەکەی بۆ گەلە کەيدا ، وە گەلەکەی بەدرۆيان خستەوە ، بەلام ئەو پشتی بە خوای گەورە بەست و  ، وە سەرکەوتنی بەدەست هينا لەدوای بانگەوازی چەندين سالی رابردووی دا ،هەر گيز کۆلی نەدا سەرکەوت لە بانگەوازيە کەی دا بە پشت بەستن بە خوای گەورە و پە ناگرتن بە خوای ميهرەبان ..!!

---

[٤٧] - سورة التوبة (١٢٩).
[٤٨] -سورة يونس (٧١) .

وەپێویستەلە سەر هەر تاکێکی موسلمان کە بانگەوازی دەکات ،دەبێت خۆراگرو بێت پشت بە ستووبێت بە خوای گەورە و میهرەبان لە بانگەوازیە کەیدا ،هەروەها خۆراگر بێت لە سەر ئەو زەحمەت و ئازرانەی کە بۆی بەر پا دەبێت لە کاتی بانگەوازی دا ،وە پشت بەستن بەخوا تاگەریگای بانگەوازی کردنە ..!!

## ٣–پشت بەستن لە پێگەی بریار دان و داد پەروەری دا :

کە (خوای گەورە ) دەفەرموێت : ﴿وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِنْ شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبِّي عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾.[٤٩] واتا: لە سەر هەرشتێکدا کێشەو رای جیاواز تان هەبوو ، ئەوە سەر ئەنجامی بریارەکەی بۆ (خوای گەورە ) خۆی دە گەرێتەوە ،چونکە هەر ئەو زاتەیە خوای پەروەردگارم هەر پشت بەو دەبەستم و هەر بۆلای ئەویش دەگەرێمەوە ..!!

بەلی ئاماژەیە بۆ دادوەرو بریار بەدەست و فەرمان رەوا ، مادەم لەسەر حەق راستیە ،وە لەسەر یەتی پشت بە خوا ببەستێت ،بۆ ئەوەی داد گەری بکات لە سەر کارو بریارو فەرمانی حەق و راست و دروستی .

## ٤–پشت بەستن لە پێگەی جیهادو تی کۆشاندا ،لە کاتی جەنگ لە گەل دوژمن دا :

﴿(خوای گەورە ) دەفەرموێت : ﴿وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ الْمُؤْمِنِينَ مَقَاعِدَ لِلْقِتَالِ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ إِذْ هَمَّتْ طَائِفَتَانِ مِنْكُمْ أَنْ تَفْشَلَا وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾.[٥٠] واتا: لێرە دا قورئانی پیرۆز لە غەزای ئوحود دا دەدوێت : یادی ئیمانداران بخەرەوە ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) کاتێك بە یانی زوو لە مال دەرچوویت ،شوێنی جەنگت بۆ ئیمانداران دیاری کرد تیر ئەندازانی لەسەر گردەکە دامەزراندو فەرمووی پێیان :ئێمە سەرکەوتوو بووین .یان شکستمان هێنا ، ئێوە شوێنی خۆتان بەجی مەهێلن ،و شوێنی ترێشی بۆ ئەوانی تر دیاری کرد ، خوای گەورەش بیسەرە ،بە گوفتارتان زانایە بە بیرو بۆ چوونتان ..!! ئەوسا خەریك بوو دوو دەستە لەئێوە پەشیمان ببنەوە لەنیوەی ری بگەرێنەوە ،بەلام خوا یاور یاوەریان بوو دلیانی دەمەزراند لەسەر فەرمانبەرداری ،دەبا ئیمانداران هەر پشت بە خوا ببەستن ..!!

---

[٤٩] –سورة الشورى (١٠) .
[٥٠] - سورة ال عمران (١٢١-١٢٢) .

هەر وەك فەرمانی (خوای گەورە ) ئەوە یە لە سەر ئیمانداران ، کە پشت بەوە ببەستن ، بە چەند ئامادە کردنیك و خۆسازاننی سوپا بۆ روو بەروو بوونەوەی دوژمن ، چونکە (خوای گەورە ) سەر کەوتن دەبەخشیت بە ئیماندران کە پشت بە خوا دەبە ستن و ، وشکست و ژیر کەوتن و سەر شۆری و زەلیلی بەدوژند دەدات ..!! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەموویت : ﴿إِنْ يَنْصُرْكُمُ اللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ وَإِنْ يَخْذُلْكُمْ فَمَنْ ذَا الَّذِي يَنْصُرُكُمْ مِنْ بَعْدِهِ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ . [٥١]

واتا: ئەگەر (خوای گەورە ) سەر کەوتنیان پی ببە خشیت ئەوە هیچ کەس ناتوانیت سەر کەویس بەسەرتاندا ، خۆ ئەگەر پشتان بەریدان ،ئەوە کی هەیە دوای کۆمەکتان بکات و سەرتان بخات ، دەبا ئە وانەی ئیماندارن هەرپشت بە خوا ببەستن ..!!

(خوای گەورە ) سەر کەوتن دەبەخشیت لە کاتی بارو دۆخی لاوازی و بی هیزی دا کە دەفەرموویت : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَنْ يَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ . [٥٢] واتا: ئەی ئەوانەی باوەرتان هیناوە یادی نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان کاتیك هەندیك ویستیان دەستدریژی بکەن سەرتان ، خوایش دەستدریژیەکەی وەستان و ئیوەی پاراست ، دەی کەواتە لە خوا بترسن و پاریزگار بن ، دەبا ئیمانداران هەپشت بە خوا ببەستن تا هەمیشە فریا یان بکەوت ولە پیلانی دوژمنان بیان پار یزیت ..!!

هەروەها لە کاتی باروو دۆخی بەهیزی دا ، کە (خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنْكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُمْ مُدْبِرِينَ﴾ . [٥٣] واتا: سویند بیت بی گومان (خوای گەورە ) لە زۆر شوینجا سەری خستن بەسەر بی باوەراندا ، لە رۆژی حونین یش کاتیك کە زۆریی ژمارە ی خۆتان سەرسامی کرد بوون ، جا بینی تان ئەو زۆریە هیچ فریاتان نەکەوت وە بی میازی نەکردن ، زەویش چەندە فراوانە لیتان هاتەوە یەك و تەنگ بووەوە ،لەوەودوا هەموو پشتان هەلکرد و راتانکرد ..!!

[٥١] - سورة ال عمران (١٦٠).
[٥٢] - سورة المائدة (١١).
[٥٣] - سورة التوبة (٢٥) .

له چیرۆكی بەسەر هاتی (موسی ) –( علیه السلام ) دا كه (خوای گەوره ) دەفەرموویت : ﴿قَالُوا يَا مُوسَى إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَنْ نَدْخُلَهَا حَتَّى يَخْرُجُوا مِنْهَا فَإِنْ يَخْرُجُوا مِنْهَا فَإِنَّا دَاخِلُونَ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ الَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمَا ادْخُلُوا عَلَيْهِمُ الْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَالِبُونَ وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ .[٥٤] واتا: كەچی ووتیان : ئەی موسی – علیه السلام – بەراستی خەلكیكی ئازاو بەرزو دلێری تیدایە ، بی گومان ئیمه هەر گیز ناچینه ناوی تا ئەوانی لیدەرنەچن ،جا ئەگەر ئەوان دەرچوون لی ، ئەوه بی گومان ئیمه دەچینه ناوی و لەوی دەبین ..! !بەلام دوو كەس لەوانه یكه ترسی (خوای گەوره ) یان له دل دابوو و خوا نازو نیعمەتی ئیمان و دلنیایی تەواوی پی بەخشیبوون ووتیان : له دەروازەی شارەوه بچنه سەریان و یەك هێرشی گەوره بەرن ، هەر كه چوونه ئه ودیوەوه ، ئەوه بی گومان ئیتر ئیوه سەركەوتوون ، دوژمنتان بەزاند شكست دەهینیت ، جا بۆ بەدەستهینانی ئەو سەركەوتنه ، دەبیت : به تەواوی پشت به خوا ببه ستن ئەگەر ئیوه ئیماندارن ..! !

## ٥–پشت بەست له پیگەی ئاشتی و پەیمان بەستندا :

كه (خوای گەوره ) دەفەرموویت : ﴿وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ . واتا:جا ئەگەر دوژمن نیازی به ئاشتی بوو ، تۆ ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم ) ئەی پیشەوا ئامادەیی خۆت دەربره و پشت به خوا ببەسته چونكه بەراستی ئەو زاته بیسەر زانایه لەپیلان و نەخشەی دوژمنان ئاگاداره ..! !

رەنگه هەندیك كه سەریان سور بمینیت..! ! كه پشت بەستن لەم پیگەیەدا یان لەم مقامەدا هەیه ..! ! وه لەدوای ئەوەی كه جەنگ و شەرو شەر زۆری كیشی ، وه دەستی كافران یان موشریكان لەسەر موسلمانان دا نەما ، ئەوا سودو بەرهەمی زۆره ئاشتی پەیمان بەستن له گەل دوژمندا ،وه پشت بەستن بەم پیگەیه دا سوودی یەكجار زۆره ..؟!

دەركەوتن و سوودی پشت بەستن یەكجار زۆره له كاتی ئاشتی و پەیمان بەستندا ، بۆ نموونه له صولح و پەیمانی حدیبیه دا ، له كاتیك دا كافرانی قریش پیان وا بوو ئەوان سەر كەوتن و له ئاشتی حدیبیه دا ، له گەل پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دا ، بەلام وا دەر نەچوو بۆ كافرانی قریش كەچی ژیر كەوتن شكستیكی زۆر گەورەیان خوارد لەم عهدو پەیمانەدا پیچەوانەبوویەوه بۆ كافرانی قەریش ، بەلام پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) به پشت بەستن به خوای گەوره سەر كەوتنیكی یەكجار گەورەی

[٥٤] - سورة المائدة (٢٢-٢٣) .

بەدەست هینا لە کاتی صولحی یان پەیمانی یان ئاشتی حودبیەدا ، ئەوەو بوو سوپای ئیسلام خۆی ریخستەوە لەم ماوەیە دا ، هەروەها چەندین هۆز تیرە هاتنە ناو ئاینی ئیسلام دا خەلکی بە کۆ مەل دەهاتنە ناو ئاینی ئیسلام ، لە نیمچە دوورگەی عەرەبی دا ئاینی ئیسلام گەشەی کردوو بلاو بویەوە ،هەروەها بووە هۆی ئەوەی بەرهەمیکی یەکجار گەورە  ئەویش فتح کردن ئازاد کردنی شاری مککە بوو لەدەست بتپەرستانی قورەیش ، ئەوە دەروازەیە کی نوی کرایەوە بەرووی موسلمانان دا بۆ بانگەوازی.

٦-پشت بەستن لە پیگەی راویژ کردن و مەشورەتدا :

کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾ . [٥٥] واتا: کە وا بوو ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم ) بە هۆی رەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هیمن بوویت لە گەلیاندا ، خۆ ئەگەر تورە و قسە رەق و بی بەزەیی بوویتایە ،ئەوە هەموو لەدەورت بلاوەیان دەکرد ،کەواتە چاوپۆشیان لی بکە ولییان ببورە و داوای لی خۆش بوونیان بۆ بکە ، لە کارو پیشهاتدا پرس و رایان پی بکە ،دوای مەشوورەت و راویژو  پرس و را  ئەگەر بریاتدا  کاریك ئەنجام بدەیت ئەنجامی بدەو  پشت بەخوا ببەستە ،چونکە  بەراستی خوا ئەوانەی خۆشدەویت کەپشتی پیدەبەستن..!!

ئەو ئایەتەی قورئانی پیرۆز ئاماژەیە بۆ راویژ کردن و مەشوورەت ،ئەوە هۆکاریکە لە هۆکارەکانی پشت بەستن ، هۆکاری راستەقینە بۆ لیکۆلینەوە بەو  شتە کە مەبەستت لیەتی کە دیاری دەکریت ،لە سەر ئەرکیك یان فەرمانیك دا ئەویش پشت بەستن بە (خوای گەورە ).

وە بروانە ئەو گەورە پیاوانەی یان دەست هەلات و فەرمانرەوایانەی کەلە شوینە بەرزە کان پیگە کانیاندا ، کە چۆن کۆدەبنەوە ،دەبینیت بە سەتان راویژکارو زاناو خبریان ،ئاماژە بە یەکیك لە پرس رایە کانیان دەکەن ، جیاوازی را دەربرینەکانیان دەکەن یەکیکیان لی وەردەگرن بە هەلە کانیان نەزانیان ئۆمەتیك سەر گەردان دەکەن چارە نووسی ئۆمەتیك سەر گەردان و ویران دەکەن دەش لین ئەوا هەلی سیاسی بووە ئەنجامان داوە نالین ئیمە پشت بە ستن بە راویژکارە نەزانانە ئەو هەلە گەورانەمان ئەنجام داوە ،کەچی پشت بە خوا نابەستن لە کاتی راویژو مەشورەتدا ،تەنها پشت بە ئارەزوو خوازانی نەزان دەبەستن ..!!

هەر بۆیە لەسەرتادا دەبیت پشت بەخوا ببەستین ،ئینجا راویژ لە کەسانیك وەرگرین کە لە خوا ترس وزانا بیت لە بوارە کەی خۆی دا ،نە ك ئارەزوومەندانی پارو مال خان و سامانی دونیا ..؟!

[٥٥] - سورة ال عمران (١٥٩).



## ٧–پشت بە ست بەخوا لە پیگەی دوا کردنی رزق رۆزی دا :

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا﴾.[٥٦] واتا: جا ئەوەی لە خوای گەورە بترسیت و پاریزگار بیت ، ئەوا (خوای گەورە ) دەرووی خیری لیدەکاتەوە ..!! لە شوینیکەوە رزق رۆزی پی دە بەخشیت کە حسابی بۆ نەکردبیت و خۆی پیی نازانیت ، جا ئەوەی پشت بە خوا ببەستیت ، ئەو زاتەی بەسە بۆ ئەوەی یاریدەدەری بیت ، چونکە بەراستی خوا کارو فەرمانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنیت ، بی گومان خوا بۆ هەموو شتیك نەخشەیەکی دیاریکراوی بریارداوە کە دەبیت پەیرەوی بکریت ..!!

وە لە (کوری مسعوود ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : گەورە ترین ئایەت لە قورئانی پیرۆز دا سپیدراو، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ .[٥٧]

لە (جابر ) – خوالی رازی بیت – دەلیت پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) : (( أيها الناسُ اتقوا اللهَ ، و أجمِلوا في الطَّلَبِ ، فإنَّ نفسًا لن تموتَ حتى تستوفِيَ رزقَها ، و إن أبطأَ عنها ، فاتَّقوا اللهَ ، و أجمِلوا في الطَّلَبِ ، خُذوا ما حَلَّ ، و دَعوا ما حَرُمَ )) .[٥٨] واتا: ئەی خەلکینە لە خوا بترسن و پاریزگار بن ،ئەگەر دوای یەکتان لە خوای گەورە کرد با بە جوانترین شیوەبیت ، هیچ نەفسیك یان رووحیك نامریت تاوە کو رزق رۆزی نەبات ، لەسەر خۆ و هیواش بن لەسەری ،لە خوا بترسن و پاریزگار بن بە جوانترین شیوە دوای رۆزق رۆزی بکەن ، ئەوەی حەلالە و وەری بگرن ئەواشی حەرامە لی دوور بکەونەوە ..!!

---

[٥٦] - سورة الطلاق (٢-٣) .
[٥٧] - المعجم الكبير ص (١٣٣).
[٥٨] - رواه ابن ماجه برقم (٢١٤٤).

## ٨- پشت بەست لە پیگەی عەهدو پەیمان بەستن دا :

ئەوە بوو (خوای گەورە ) هەوالی دایە (یعقوب ) – علیه السلام – کە پشت بە خوا ببەستە لە کاتیك دا کە لە گەل منداله کانی یان کورە کانی خۆی قسەی دە کردو عهدو پەیمانی لی وەردە گرتن ،تاوە کو بنیامین بە سلامەتی بۆی بگەرینەوە بە پەندی (یوسف ) – علیه السلام – نەبن کەو ووتیان : گورگ خواردی ، بەلام ئەم جارەیان عهدو پەیمانیان لی وەر دە گریت ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَأَرْسِلْ مَعَنَا أَخَانَا نَكْتَلْ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ .[٥٩]

واتا: برکەمان لە گەل دا بنیرە تا پیوانە بکەین (بەدەست بە تالی نەگەرینەوە) بەلین بیت پاریزرین بۆی ..!! ئینجا (یعقوب ) – علیه السلام – ووتی: ﴿قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُ مَعَكُمْ حَتَّى تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِنَ اللَّهِ لَتَأْتُنَّنِي بِهِ إِلَّا أَنْ يُحَاطَ بِكُمْ فَلَمَّا آتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ اللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ .[٦٠] هەر گیز لە گەلتاندا ناینیرم هەتا پەیمانیکی خواییم پی نەدەن (سویند نەخۆن ) کە بی گومان بی گەرینەوە بۆ لای من ، مەگەر دەورە بدرین و هیچ دەسەلاتتان نەمینیت ، جا کاتیك پەیمانەکەیان دایە و سویندیان بۆ خوارد ، (یعقوب ) – علیه السلام – ووتی : خوا خۆی ئاگادارو چاودیرە بە پەیمانەی کەبریارمان لەسەر داوە ..!! ووشە ی (الموثق) واتە: عهد و پەیمان ئیمانیکی زۆر بتەوە بەهیزو ئەستوور ..!! ئینجا (یعقوب ) – علیه السلام – بە کورە کانی خۆی ووت: ﴿وَقَالَ يَا بَنِيَّ لَا تَدْخُلُوا مِنْ بَابٍ وَاحِدٍ وَادْخُلُوا مِنْ أَبْوَابٍ مُتَفَرِّقَةٍ وَمَا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾ . [٦١] واتا: کورەکانم هەمووتان لە یەك دەرگا یان دەروازە مە چنە ژوورەوە ، وە لە چەند دەرگا یەك یان دەروازەیەکی جیاجیا بچنە ژوورەوە ، خۆتان بکە بە ناو شار دا ، دلنیاش بن کە من ناتوانم هیچ شتیك یان بە لاو نەهامەتی یەك یان پیشهاتیك کە بریاری (خوای گەورە ) لەسەر بیت بی گەرینمەوە ، وە لە ئیوە هیچ فەرمان و بریاریك بۆ کەس نیە ، تەنها بۆ (خوای گەورە ) نەبیت ،پشت هەر بە و زاتە ببەستن ،وە پشت و پەنا هەر ئەو زاتەیە ، جا دەبا ئەوانەی کە پالپشت و پشتیوانیان دەویت هەر پشت بەو ببەستن ..!!

---

[٥٩] - سورة یوسف (٦٣).
[٦٠] - سورة یوسف (٦٦).
[٦١] -سورة یوسف (٦٧).



## ٩-پشت بەستن لە پیگەی کۆچ کردن یان هجرەت کردندا :

ئەم پیگەی زۆر بە ئیش و ئازارە لە سەر نفسی هەر کەسیك کە کۆچ بکات یان هجرەت بکات لەوە تیك بۆ وەلاتیکی تر یان لە مەملە کەتیك بۆ مەملە کەتیکی تر یان لە شاریك بۆ شاریکی تر دا ، هەر بۆیە (خوای گەورە ) وسفی بەندە کانی دەکات ئەوانەی کە پشت بەستووە بە خوای گەورە ئەوانە کۆچ دەکەن یان هجرەت دەکەن پشت بەخوا دەبەستن لە پیناوی خوا کۆچ و هجرەت دە کەن ، چونکە کۆچ کردن یان هجرەت کردن نفسی هەر مرۆڤیك ئازارد دەدات ، بەوەی کە شوین و هەواور مال حالی بەچی دەهیلیت ، سەری لە سوردەمینی قوربانی و زیانی پیدەگات ،چونکە خزم کەس و کاور عەشیرەت و هۆزە تیرە کەی خاو خیزانی خۆشەویستانی بەجی دەهیلیت و لەوە شاریك بۆ شاریکی تر یان لەوە لاتیك بۆ وەلاتیکی تر کۆچ دەکات ، بەلام ئەوەش نابیت بە کەم سەیر بکریت کە کۆچ کردن یان غریبی لە ولاتیك لە پیناوی خوا دا چەندە بە ئازارە ..!! سەرە رای ئەم خەم و پەژارەیە دەبیت هەر پشت بە خوا ببەستین لە کاتیك کۆچ کردنمان تەنها ئەو زاتە پشت و پەناهەمان لە هەموو کاتیدا ئەو زاتە دلنەوایمان دەکات پشت و پەنامانە دەبیت خۆراگرو ئارام گرین پشت بە خوا ببەستین ..!! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَالَّذِينَ هَاجَرُوا فِي اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَلَأَجْرُ الْآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ .[٦٢] واتا: ئەو کەسانەی لە بەر خوای گەورە کۆچیان کرد ، بۆ پاراستنی ئیمانەکەیان ،دوای ئەوەی کەستەمیان لی کرابوو ، ئەوە هەر لە دونیادا بە چاکی و ریزەوە نیشتە جیان دەکەین ، بی گومان پاداشتی ئەو جیهان گەورە ترە فراوانترە بۆیان ، ئەگەر دەیانزانی ..!! ئەوانەش ئەوانەن کە بە ئارام و خۆگر بوون و پشت بە پەروەردگایان دەبەستن ..!!

---

[٦٢] - سورة النحل (٤٢-٤٢) .

وه بروانه كۆچ كردنی یان هجرەت كردنی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە گەل هاوەلە كانی دا لە ریگای كۆچ كردن دا ، كە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِلَّا تَنْصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ الَّذِينَ كَفَرُوا السُّفْلَى وَكَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ .[63] واتا: ئە گەر ئیوە پشت گیری پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) نەكەن و یارمەتی نەدەن ، ئەوا بەراستی خوا پشت گیری كردوو سەری خست ، كاتیك ئەوانەی بی باوەر بوون دەریان كرد لە شاری مككە و یەكیك بوو لەو دوو كەسە كاتیك هەردووكیان لە ناو ئەوشكەوتەكەدا بوون ، كاتیك بی باورە كان گەیشتبوونە دەوربەری ئەشكەوتەكە (ابو بكری هاوەلی ) خەمی بۆ هات ، پیغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم ) دل نەوایی دایەوە وپی فەرموو : خەفت مەخۆ دلنیابە خوا مان لە گەلە ،ئەو سا ئیتر خوا ئاسوودەیی و ئارامی خۆی دابەزاندە سەری و پشت گیری و بەهیزی كرد بە سەربازانیك كە ئیوە نەتان دەبینین و بەرنامە ئاینی بی باوەرانی سكشت پی هیناو ریسواتری كرد ، بەرنامە ئاینی خوای گەورەشی بۆ هەمیشە بەرزو بلندترە ،خوایش هەمیشە بالادەست و دانایە ..!!

١٠-پشت بەستن لە پیگەی ئەنجامدانی گریبەستی كرین و فرۆشتن و بەكریدان و گریبەستی هاوسەرگیری:

ئەوە لەباس و چیرۆكی (موسى ) – علیه السلام- كە لە گەل پیاویكی چاكە كار دا ریكەوتنی بەست یان ئەتفاقی بەست بەوەی كە گریبەستەكە ئەوە بوو (موسى ) بەكری بكریت شوانكاری بۆ بەكات بۆ هەشت سال یان دە سال ،ئەویش لە بەرانبەری دا كچیكی خۆی لی مارە بكات ،ئەوە گریبە تەكە بوو كە (موسى ) – علیه السلام - لەگەل پیاو چاكە كە ئەنجامی دا ..!! كە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنْكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَنْ تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِنْدِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ قَالَ ذَلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ .[64] واتا: باوكیان پشنیارەكەی پی باش بوو بۆیە ووتی : من پیم چاكە بتكەم بە كوری خۆم ، بە زاوای خۆم ، یەكیك لەم دوو كچە لی مارە بكەم بەمەرجی ئەوەی هەشت سال لای من كار بكەیت ،خۆ ئەگەر دە سالیش بردە سەر ئەوە چاكەی خۆتە ، منیش ،نامەویت بیزارت بكەم و زۆرت بۆ بهینم ،دەمبینت ئەگەر خوا بیەویت لە چاكان دەبم ؟! (موسى) – علیه السلام- پیشنیارە كەی لا پە سەند بوو بۆیە ووتی : ئەم پەیمانە لە نیوان من تۆدایە ،من پی رازیم ،بەلام هەركام لەو ماوانەم بۆ تەواوكرا باستەمم لی نەكریت وئازادبم ،(خوای گەورە ) ش شایەت و ئاگایە بەوەی كە دەیلیین و بریاری لەسەر دەدەین ..!!

[63] - سورة التوبة (٤٠) .
[64] سورة القصص (٢٧- ٢٨).



ئەوە بوو کە (موسی ) کە چۆن بڕیاری دا بوو دە سالی خۆی بە سەر برد و بە تەواوی ، ئەوە بوو وعد و پەیمانی خۆی لە گەل پیاو چاکە کە بردە سەر  کە (کوری عباس ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : ((قَضَى أَكْثَرَهُمَا وأَطْيَبَهُما" إِنَّ رَسولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ إذَا قالَ فَعَلَ)) .[٦٥] واتا: زۆر بە چاکی و باشی وعدە کەی خۆی بەسەر برد ، وە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ئەو کارە کەی کردووە .  (واتە : (موسی) – علیه السلام – رە سەن و شایەنە ئەو کارە کەی تەواو کرد ..!!

## ١١- پشت بەستن لە پیگەی دواکردنی دوا رۆژد یان مالی قیامەت  :

کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَمَا أُوتِيتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ .[٦٦] واتا: جا هەر شتیکتان پی بە خشرا ئەوا لە زەت و زینەتی ژیانی ئەم دونیایە یە ، کە گشتیکە یان ری گوزەریکە بەرەو قیامەت یان دوا رۆژ دا ، بەلام ئەو بەشەی کە لای (خوای گەورە ) یە (واتە قیامەت و دوا رۆژ ) چاکترو بەردەوام ترە هەمیشە ترە ، بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هیناوە و هەر پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن ..!!

وە ئایا  پیگە یەك هەیە گەورە ترو باشتر بیتە لەم پیگە یە دا ..؟! چونکە دوا رۆژ هەر کەسیکی ئیماندار ئەوا ئەو شوینەیە کە شوینکی ئەمان و هیمن و ئاسایش ئارامە ، ئەوەش دواکاری هەموو ئیمانداریکە یان باوەڕداریکە ، هەر کاریکی ئیمانداران دەبیت پشت بە خوا بە بەستن بۆ دوا کردنی ئەو مالەی بۆ هەتا هەتایی یان بۆ هەمیشە ئەو یش مالی دوا رۆژی هەموو ئیمانداریکە کە شەو رۆژ بۆ هەول دەدات کە گەشت بکات بۆ ئەو مالەی هەر دە بیت سەردانی بکات ،وە گەیشتن بە م مالە دەبیت پشت بە خوا ببەستین ،لە کارو کردەوە کانی ژیانی دونیادا ، هەر کاریکی چاکە پشت بە خوا بەستن ئەوا ریگا ئاسان دە کات بۆ مالی هەمیشەیی مالی هیمن و ئارام ..!!

---

[٦٥] رواه البخاري برقم (٢٥٣٨).
[٦٦] - سورة الشورى (٣٦).

## یەکەم: ئەوەی پشت بە (خوای گەرە ) ببەستیت (بەسە) کفایەتە :

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا﴾.[٦٧] واتا: جا ئەوەی لە خوای گەورە بترسیت و پاریزگار بیت ، ئەوا (خوای گەورە ) دەرووی خیری لیدەکاتەوە ..!! لە شوینیکەوە رزق رۆزی پی دە بەخشیت کە حسابی بۆ نەکردبیت و خۆی پیی نازانیت ، جا ئەوەی پشت بە خوا ببەستیت ، ئەو زاتەی بەسە بۆ ئەوەی یاریدەدەری بیت ، چونکە بەراستی خوا کارو فەرمانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنیت ، بی گومان خوا بۆ هەموو شتیك نەخشەیەکی دیاریکراوی بریارداوە کە دەبیت پەیرەوی بکریت ..!!

(خوای گەورە ) لە هەموو کاریك پاداشتی داوە لەجنسی کارە کەدا یان لە بەشی کارە کەدا ، وە پاداشتی پشت بەستنیش ئەوا (بەسە ) یان کفایەتە ، وە ئەوەی کە خوای بەسە ،ئەوا خوا بە سە بۆ ئەوە ،وە هەر کەسیك پشت بەخوا ببەستیت ئەوا ئەو زاتە بەستە بۆ ئەوەی یاریدە دەری بیت کفایەتی بیت ..!!

کاتیك بوو کە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیەوسلم ) بەرزترین و گەورە ترین خەلك بوو ئەوە بوو پشتی بە خوای گەور بەست ، ئەوە بوو (خوای گەورە ) پاداشتی پیدا بەوەی کە ئەو زاتە بەسە و بۆ یاوەر یاریدەدەری ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللَّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾.[٦٨] واتا: ئەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم ) تەنها خوا بەسە بۆ خۆت و ئەوانەی شوینت کەوتوون لە ئیمانداران کە پشت گیرو یاریدەدەرتان بیت و بەسە ..!! وە (خوای گەورە ) دەفەرموویت: ﴿وَإِنْ يُرِيدُوا أَنْ يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ اللَّهُ هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ﴾ . واتا:خۆ ئەگەر خوا نەناسان یان بی باوەران (بە داخوازی ریکەوتن و ئاشتی ) ویستیان هەلتبە خەلەتینن ،ئەوە دلنیابە کە پشتیوانی خوا (بەسە ) نە نەهیلیت بکەویتە ناو پیلان و نەخشەی بی باوەران ، چونکە هەر ئەو زاتە کاتی خۆی پشتوانی لی کردیت و سەری خستیت و ئیماندرانیشی کرد هۆیەك بۆ بەدەستهینانی سەرکەوتن ..!!

---

[٦٧] - سورة الطلاق (٢-٣) .
[٦٨] - سورة الانفال (٦٤).

بی گومان یارو یاوەرو یاریدەدەری تۆ ئەی پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) و ئیمانداران ئەوانەی راست گون لە گەڵ خوای خۆیان و پشتی پی دە بەستن بە سەو کفایە تە ..!!

لە (ابن القيم ) – رەحمەتی خوای لی بیت – (( لەواتای ﴿حَسْبُكَ اللَّهُ﴾ واتە : خوا بە سە ، وە هەر کەسیك خوای بەسە بۆ پاریزگاری یان پاریزەری ، تامەزۆری دوژمن نابیت ، وە هەرگیز ناتوانی زیانی پی نبگەیەنی مە گەر ئازاریکی کەم نە بیت لە دوژمن دا ،هەروە ك مەبەستی لە ﴿لَنْ يَضُرُّوكُمْ إِلَّا أَذًى﴾ واتە: هەرگیز ناتوانن زیان لە بیرو باوەرتان بدەن مەگەر ئازاریکی کەم نەبیت ..!! وە لە کاتی گەرمادا یان لە کاتی ساردو سەرمادا ، وە یان لە کاتی بر سیەتی دا و یان لە کاتی تینوویەتی دا ، وە ئەگەریش زیان لە دوژمن بە ئیوە گەیشت تەنە زیانیکی کەم نەبیت ،بەوەی کە لە پشدا ووتمان )).[69]

وە یەکیك لە چیرۆکە کانی هاولاتیەکی موسلمانی وەلاتی شیشان لە کاتی موسمی یان مەراسمی حەج کردن ئەم چیرۆکەی خۆی گیرایەوە کە چۆن لە کاتی تەنگانەدا پشتی بە خوا بەستبوو ، هاولاتیە شیشانیە کە دەگیرتەوە : ( لە کاتیدا رووسیە کان مە لە کەی منیان گەمارۆدا بوو ،وە هەموو خاو خیزانەکە لە و مالە دا ریان کردو هەلهاتن ، بەتەنها من مامەوە نەم توانی رابکەم ،چونکە مالە کە گەمارۆی سوپای رووسیا درا بوو ، لە کاتیکد دا گەمارودرا بووم لە لایەن رووسیەکانەوە تەنگاو بووم خۆ فریدایە ناو قورتیك لە تەنیشت مالە کەدا کە قورتی بە تاتەبوو کە بۆ هەلگرتنی بە تاتەکان ، بەلام هیچ چەك و سیلاحیکم پی نەبوو بۆ بەرگری کردن کە پی لەخۆم بکەم ، وە نەشم دەتوانی رابکەم ،وە کاتیك کە سەربازەکان نزیك بوونەوە لە قورتەکەی کەمن تیدا بووم کە پشت و ئەعتمادی خۆم لەسەر بکەم ، جگە لە (خوای گەورە) کەپشتی پی ببەستم وە ئەم ئایەتی قورئانی پیرۆزم دە خویندەوە کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَجَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ﴾ .[70] واتا: هەروەها بەربەستیان لەبەردەمیانەوە و لە پشتیانەوە داناوە پەردەشمان هیناوە بەسەر چاویاندا (مەبەست ئەو بەربەستانەشە کە لە دەروونیاندا هەیە ونایەلیت ریگەی راست بدۆنەوە )ئیتر ئەوانەحەق راستی نابینن ..!!بەلی تاوە کو یەکیك لە سەربازەکان هات لە ناو قەرتە کە گەرا ، وە راستەخۆ تەماشای منی کرد یان چاوی لە ناو چاوی کردم ،هەروەها ووتی : بە هاوری سەربازەکانی هیچ کەسیك لە ناو ئەو قورتە دا نیە ،دواتر لە مالە کەدا رۆیشت چونەدەروە منیان بەجی هیشت ،منیان نەبینی ..!! وە ئەوش لە سوودەکانی پشت بەستن بە خوای گەورە دا وە ئەم چیرۆکە زۆر کاریگەرە بەوەی کە مرۆڤ پەندو ئامۆژگاری لی وەر بگریت ..!!

---

[69] - بدائع الفوائد (٢/٤٦٥).
[70] - سورة يس (٩).



## دووەم : هەست كردن بەوەی كە (خوای گەورە ) چاودیرو پاریزگارتە :

چونكە هەركاتیك ئادەمیزاد پشتی بە خوا بەست وا پەناو ئەعتمادی لە سەر خوای گەورەكرد ،ئەوا هەست دە كە كە خوای گەورە زۆر لی نزیكە ،چونكە چاودیرو پاریزگاری كردنە لە سەر پشت بەستنە بە خوای گەورە ، ئەوا هەست دە كات كە خوای گەورە چاودیری دەكات و دەپاریزی لە هەموو كات دا ..!!

## سی یەم : بەدەست هینانی خۆشەویستی (خوای گەورە ) :

كە (خوای بەرزو بلند ) ئەو كەسەی خۆشدەویت كە پشتی پی دەبەستیت و حەقی پشت بستووە كەی دەداد ،چونكە ئەو پشت پی بەستنە كاریكە بە فەرمانی خوای گەورەیە ، وە وەرگرتنی هۆكارە كان كە خوای گەورە روونی كردۆتەوە ،وە هەندیك لە دل و دەروونداپە،وە ئەوەش بە خوای گەورە بەستراوە ..!!

هەروەكو ئەوەی كە بەندە پشتی بە خوای گەور بەست ، ئەوا (خوای گەورەی ) زیاتر خۆشدەویت كە دورست كەریەتی ،چونكە دەزانیت كە تسلیم  پەناهەو چاودیرەو لایەنگریەتی ودەولە مەندە لە هەمووشتیك دا رزق رۆزی دەریكی هەموو گیان داریكە ..!!

## چوارەم : سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا :

ئەوەی پشت بەخوا ببەستیت ئەوا خوای گەورە بەسەر دوژمنەکانی سەری دەخات یان سەرکەوتنی پی دەبەخشیت ،وە لەگەل چەند هۆکاریك لەسەریان ، وە لەپشیدا دەبیت وەری بگرین ،وە هاوەلانی پیغەمبەری خوا ئەم کارانەیان ئەنجامدا ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ (١٧٣) فَانْقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ﴾ .[٧١]

واتا: خوامان بەسە یاریدەدەور یارمەتیدەریکی باشە و چاکە ..!! ئینجا ئیتر موسلمانان گەرانەوە لەگەل فەزل و نازو نیعمەتی خوا دا ، هیچ نا خۆشیە کیشیان بۆ پیش نەهات ، چونکە شوینی رەزامەندی خوای گەورە  کە تبوون ، هەر ئەوەشیان مەبەست بوو ، خوای گەورەش هەر خۆی خاوەنی فەزل و ریزیکی زۆر گەورەیە ..!!

هەروەها (خوای گەورە) وەسفی موسلمانان دەکات لە غەزای خەندەق یان غەزای الاحزاب دا  ، دەفەرموویت :﴿ وَلَمَّا رَأَى الْمُؤْمِنُونَ الْأَحْزَابَ قَالُوا هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّا إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا﴾ .[٧٢] واتا: کاتیك کە ئیمانداران  ئەوهەموو دەستە و گرۆهانە یان  بینی ، ووتیان : ئەمە ئەوەیە کە خوا و پیغەمبەرە کەی (صلى الله عليه وسلم ) بەلینی پیداوین  (کە ئاوا دژایەتی ئایینەکەی دەکریت و کافران و دوو رووەکان نەخشەو پیلان دەکیشن بۆ ریشە کیش کردنی موسلمانان ، دیارە کە خوا و پیغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم )  راستیان فەرمووە لە پیش هاتنیدا ، بی گومان ئەو دژایەتیە باوەرو ملکەچی نەبیت هچیی تری بۆ زیاد نەکردن وە دامەزراوتر بوون لەسەر ئیمان و  باوەریان ..!!

[٧١] -سورة ال عمران (١٧٣-١٧٤).
[٧٢] - سورة الاحزاب (٢٢).

## پینچەم : چوونە ناو بەهەشت بە بی حیساب یان بە بی لی پیچینەوە دا :

وە لەوە فەزلی پشت بەستن بە (خوای گەورە ) دا هاتووە ،ئەوا بەم هۆکارەوە دەچنە ناو  بەهەشتەوە حەفتا هەزار کەس لە ئۆمەتی محمد (صلی الله علیه وسلم ) بە بی حساب و لی پیچینەوە ..!!

لە (کوری عباس ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : لە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : ((عُرِضَتْ عَلَيَّ الأُمَمُ، فَجَعَلَ النبيُّ والنَّبِيَّانِ يَمُرُّونَ معهُمُ الرَّهْطُ، والنَّبِيُّ ليسَ معهُ أحَدٌ، حتَّى رُفِعَ لي سَوَادٌ عَظِيمٌ، قُلتُ: ما هذا؟ أُمَّتي هذِه؟ قيلَ: بَلْ هذا مُوسَى وقَوْمُهُ، قيلَ: انْظُرْ إلى الأُفُقِ، فَإِذَا سَوَادٌ يَمْلَأُ الأُفُقَ، ثُمَّ قيلَ لِي: انْظُرْ هَاهُنَا وهَاهُنَا في آفَاقِ السَّمَاءِ، فَإِذَا سَوَادٌ قدْ مَلَأَ الأُفُقَ، قيلَ: هذِه أُمَّتُكَ، ويَدْخُلُ الجَنَّةَ مِن هَؤُلَاءِ سَبْعُونَ أَلْفًا بغَيرِ حِسَابٍ. ثُمَّ دَخَلَ ولَمْ يُبَيِّنْ لهمْ، فأفَاضَ القَوْمُ، وقالوا: نَحْنُ الَّذِينَ آمَنَّا باللَّهِ واتَّبَعْنَا رَسولَهُ، فَنَحْنُ هُمْ، أوْ أوْلَادُنَا الَّذِينَ وُلِدُوا في الإسْلَامِ" فإنَّا وُلِدْنَا في الجَاهِلِيَّةِ، فَبَلَغَ النَّبِيَّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم فَخَرَجَ، فَقالَ: هُمُ الَّذِينَ لا يَسْتَرْقُونَ، ولَا يَتَطَيَّرُونَ، ولَا يَكْتَوُونَ، وعلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ، فَقالَ عُكَاشَةُ بنُ مِحْصَنٍ: أمِنْهُمْ أنَا يا رَسولَ اللَّهِ؟ قالَ: نَعَمْ، فَقَامَ آخَرُ فَقالَ: أمِنْهُمْ أنَا؟ قالَ: سَبَقَكَ بهَا عُكَّاشَةُ)) .[٧٣]

واتا: ئۆمەتەکان خرانە بەر چاوم ، دەبینم کە پیغەمبەر هەیە کەسی لەگەل دانیە ؟! وە پیغەمبەر هەبووە یەك پیاو یان دوو پیاوی لە گەل دا بووە ..!!، وەپیغەمبەر هەبوو یەك کەسی شی لە گەل دا نەبووە..!! ئینجا خەلکیکی زۆرم پیشاندرا کە گومانم کرد ئۆمەتەکەی من بن ؟! وە پیم ووترا : بروانە بۆ ئاسۆیەکی تر ، سەیرم کرد دەبینم خەلکیکی زۆرە ..!!ووتم : ئەوە ئۆمەتی منە ؟! پیم ووترا: ئەو ئۆمەتەکەی (موسی ) – علیه السلام – پیم ووترا : سەری بۆ ئاسۆیەکی تر سەیر بکە خەلکیکی زۆر پیشاندرا ، ئینجا پیم ووترا : بروانە ئەوە ئەوە لە ئاسۆیەکی  ئاسماندا خەلکیکی زۆر بوون پیم ووترا: ئەوە ئۆمەتەکەی تۆیە ..!! حەفتا هەزاریان لە گەل تۆدا دەچنە بەهەشتەوە بەبی لیپرسینەوە سزایان لە سەر نیە بە بی حیساب دەچنە بەهەشتەوە ..!!

[٧٣] رواه البخاري  برقم (٥٧٠٥)  و مسلم (٢٢٠).

ئینجا پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم )هەستا جووە مالەوە ئینجا خەلکە کە کەوتنەباسکردنی ئەوانەی کە بەبی لیپرسینەوە سزا بەبی حیساب دەچنە بەهەشتەوە ووتیان : لەوانەیە هاوەلانی پیغەمبەری خوا (صلی علیەو سلم ) هەندیکی تریان ووتیان : لەوانە یە ئەو کەسانە بن لەسەردەمی ئیسلام لەدایك بوون شریك بۆخوا بریانەداوە ..!! ئینجا پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) هاتەدەرەوە بۆ ناویان فەرمووی باسی چی دەکەن ..؟! ئەوانە ئەو کەسانەن کە نووشتەو جادوو ناکەن و دوای نووشتە کردن ناکەن .!! رەشبین نین پشت بەخوای گەورە دەبەستن ..!!وە (عکاشەی کوری محصل ) هەستاو ووتی : لە خوا داوا بکە بمان خاتە ناو ئەوانە ؟!پیغەمبەریخوا (صلی الله علیەوسلم ) بە (عکاشەی ووت: تۆ لەوانی ،ئینجا پیاویکی تری هەستاو ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دوا بکە خوای گەورە بخاتە ناو ئەوانە ..؟! پیغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : (عکاشە) پیشت کەوت ..!!

## شەشەم : بەدەست هینانی رزق رۆزی :

له (عمری كوری خەتاب ) – خوا لی رازی بیت – دە گیرتەوە دەلیت : پیغەمبەری خوا فەرموویەتی : ((لو أنَّكم توَكَّلتم على اللهِ حقَّ توكُّلِه ، لرزَقَكم كما يرزقُ الطَّيرَ ، تغدو خماصًا ، وتروحُ بطانًا)) .[٧٤]واتە : ئەگەر بەراستی پشت بە خوا ببەستن خوا رزق رۆزیتان دەدات ، وەك چۆن رۆزی بالندە دەدات بەیانیان بە برسیەتی لە هیلانەكەی دەردەچیت وە ئیواران بە تیری دە گەریتەوە ..!!

## حەوتەم: پاراستنی نەفسی خۆت خاوخیزان مال مندال :

ئەوە بوو (یعقوب ) – علیه السلام ) ئامۆژگاری كورەكانی خۆی كرد ،بەو ئامۆژگاریانەی كە بۆ پاراستنیا لە هەموو كارو فەرمانیك دا بە گەرینەوە بۆ لای (خوای گەورە ) تەنها پشت بەو ببەستن ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَقَالَ يَا بَنِيَّ لَا تَدْخُلُوا مِنْ بَابٍ وَاحِدٍ وَادْخُلُوا مِنْ أَبْوَابٍ مُتَفَرِّقَةٍ وَمَا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾ . [٧٥] واتا: كورەكانم هەمووتان لە یەك دەرگا یان دەروازە مە چنە ژوورەوە ، وە لە چەند دەرگا یەك یان دەروازەیەكی جیاجیا بچنە ژوورەوە ، خۆتان بكە بە ناو شار دا ، دلنیاش بن كە من ناتوانم هیچ شتیك یان بە لاو نەهامەتی یەك یان پیشهاتیك كە بریاری (خوای گەورە ) لەسەر بیت بی گەرینمەوە ، وە لە ئیوە هیچ فەرمان و بریاریك بۆ كەس نیە ، تەنها بۆ (خوای گەورە ) نەبیت ،پشت هەر بە و زاتە ببەستن ،وە پشت و پەنا هەر ئەو زاتەیە ، جا دەبا ئەوانەی كە پالپشت و پشتیوانیان دەویت هەر پشت بەو ببەستن ..!!

چونكە (خوای گەورە ) دەمان پاریزەری ،كە ئەو كە سی چاودیری كردنی نەفسی خۆی و خاو خیزان و مندالی وابەستەی (خوای گەورە ) دەكات ..!!

٧٤ - سنن الترمذي رقم (٢٣٤٤).
٧٥ -سورة يوسف (٦٧).



## هەشتەم : دەمان پاریزی لە شەیتان :

کە (خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿إِنَّمَا النَّجْوَى مِنَ الشَّيْطَانِ لِيَحْزُنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيْسَ بِضَارِّهِمْ شَيْئًا إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ . [٧٦] واتا: بەراستی چپەی خراپ و نابەجی هەر لە شەیتانەوەیە ، تا ئەوانە غەمبار بکات کە باوەریان هیناوە ،وە نەبیت ئەو چپەیەهیچ زیانیکیان پی ناگەیەنی مەگەر ویستی خوا لەسەر بیت ،دەبا ئیماندران هەر پشت بە خوا ببەستن تا لە زیان بە دوور بن ..!!

لە نیوان (خوای گەورە ) دا و شەیتان دا ،ئەوەیە کە شەیتان ناتوانی هیچ زیانیك بە بەندە كانی (خوای گەورە ) بەگەیەنی جگە لەوەی کە مۆلەتی و ئیزینی (خوای گەورە )ی لەسەر نەبیت تەنها بە مۆلەتی (خوای گەورە ) نەبیت ، ئینجا بەندەی خوا بۆ هەرکاریك با پشت بەو زاتە ببەستیت ،وە لە سەر (خوای گەورە ش ) ئەوەیە کە بەندە کەی بپاریزی لە هەموو ووسەوە سەو خراپە کاریە کی شەیتان ..!!

لە (ئەنسی کوری مالك ) – خوا لی زرای بیت – دەلیت : لە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) وە فەرموویەتی ((من قال ، يعني إذا خرج من بيتِه : بسمِ اللهِ توكَّلتُ على اللهِ لا حولَ ولا قوَّةَ إلَّا باللهِ ، يُقالُ له : كُفيتَ ووُقِيتَ وتنحَّى عنه الشَّيطانُ )) [٧٧]. واتا: هەر کەسی کاتیك لە مال دەربچی و بلی : (بسم الله توكلت على الله لا حول ولا قوة إلا بالله ) واتە : بەناوی پیرۆزی خوا ، بە پشتوانی خوا لە مال دەردەچم ،هیزو توانایی هەر بەدەستی خوا خۆیەتی و بەس ، وە پی دە ووتریت : هیدایەت درایت ، و کیفایەت کرایت و پاریزراویت لە شەیتان ..!!

[٧٦] - سورة المجادلة (١٠).
[٧٧] - سنن الترمذي (٣٤٢٦).

## نۆیه: ئارامی دەروون :

هەرچی بیت بەندە بۆ وەرگرتنی هۆكارەكان بۆ لیكۆلینەوە كە ئەوەی دەیەویت ،وە هیچ كەلینیك و بۆشایەك بۆ ئەوە نەمایەتەوە تاوە كو لەسەری پیویست نابی و بەردەوام نابی ، كە دەترسیت و دەزە دەكات شكست دەهینی ،وە ناگات بەوەی كە مەبەستی یەتی لەو ماوەیەدا ، بەلام هەركاتیك كە متمانەو پشت بەستنت بە خوای گەورە هەیە ، ئەوا ئەو كاتە دەزانی كە خوای گەورە بەسە بۆ هەموو بارودۆخیك و بۆ هەموو فەرمانیك  بۆ هەموو دەست پیكی هەركاریك ، ئەو كاتە هیچ لەم بۆشایانەی كە هەیە ناترسیت یان ئەو كون كەلینەنەی لەژیانی رۆژانەدا هەن بە هیچ شیوەیە ك لیان ناترسیت ،چونكە خوا بەسە بۆ ئەوەی پشتیوانت بیت لە هەموو بارو دۆخیك دا ، بەلی ئەو كات هەست دەكەیت كە دەروونت ئارام بۆوەتەوە هەست بە دلنەوایی یكی زۆر دەكەیت كە پشت و پەنات بە خوا هەیە ، وە میشك و دماغ راحەت و ئارام دەبیت ، بەلكو پشت بەستن بەخوای گەورە مرۆڤ هیمن دەكاتەوە لە رووخاندنی دەروون دوورە بوونی نەفس و دوورن ، تەنانەت پزیشكە دەروونیە كان ئاگادرمان دەكەن وە لەوەی گرینگ ترین چارە سەری دەروونی ئەوەیە كەپشت بەستنە ، ئەوە یەكیك لە هەر چارە سەریە كانی دەروونی ..!!

وە ئەگەر ئەو كەسانەی كە خۆیان ئەنتحار یان خۆ كوژی خۆیانن ،ئەوا پشت بە خوا ببەستن و حەقی پشت بەستنەكەیان بەخوا بە تەواوی بدەن ،ئە وا بۆچی كەش هەوایەك یان جەویك دروست دەبیت بۆ ئەنتحار یان خۆ كوشتنیان ..؟! بی گومان هەر هەموو فەرمانیك بۆ لای خوای گەورە دەگەریتەوە ،وە دەبیت دەروونی خۆمان ملكەچ و تەسلیمی ئەو زاتە بكەین ، وە رازی بین بە فەرمانەكانی هەرچەیەك لە خوا وە بیت ،وە رازی بین بە چارە نووس و قەزاو قەدەری خوای بەرز بلند ..!!

## دەیەم : ویست و پەرۆشی بۆ دیاری کردنی کارکردن :

بی گومان پشت بەست بەخوا ویست و پەرۆشی دڵ بۆ دیاری کردنی کار کردن ، چونکە کردنەوەی هەموو دەرگایەك دەبیت بە وەرگرتنی هۆکارە کان بیت بۆ گەیشتن بۆ هەر پرۆژەیەك ..!! وە لەوەی تی گەیشتی کە پشت بەستنەکەی روون بووە بە راست و دروستی، وە فەهمیکی باشت دەست کەوت بە پشت بەست بە خوا ، ئەوا دەچیت بۆ کارە کە بە وەرگرتنی هۆکارە کان ،وە ئەو کاتە دەبیتە هاندەریکی زۆر باش بۆ بەرهەم هینان ..!!

## یانزەم : شکۆمەندی و دەولەمەندی و شانازی دەروونی یان نەفس :

موسلمان کەی پشت بەستوو دەبیت بە (خوای گەورە بەزرو بلند) ؟! ئەو کاتەی کە ملکەچی فەرمانەکانی(خوای گەورە )بوو ، ئەو کاتە هەست بە شکۆمەندی خۆی دەکات ، چۆنکە ئەو وابەستەی بە خوای بەریزە یان عەزیزە ، هەروەها کە چۆن لە ناو خەلك دا شکۆمەندو دەولەمەندە بیت ، چونکە دەولە مەندە و شکۆمەندە بەمال سامانیکی زۆر کە خوای گەورە پی بەخشیوە بەنعیمەتەکانی خوا دل دەروونی دەولە مەندە ،چونکە پشتی بە خوا بستووە ..!!

کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ . واتا: ئەوەی پشت بە خوا ببەستیت ئەوە بەراستی خوا بالادەست و دانایە ..!! وە کو هاتووە بە ناوی (العزیز ) لەدوای پشت بەستن ، تیبینی دەبینی پشت بەستن لە سەری شکۆمەندی و عزە ت کرامەتە ، داینەناوە سەر یان نەی ختسووەتە سەر پەناگرتنە کە ی یان یارمەتی دانەکەی ..!!بەلکو ناوی (الله ) دیت ئیجا ووشەی (عزیز حکیم) دیت لە دوای پشت بەستن .

# پشت بەستن : زانینی دڵ و کارەکانی

بەلی پشت بەستن بە (خوای گەورە ) کۆکەرەوەی زانینی دڵ و کارە کانی دڵ .

سەبارەت بە زانینی دڵ : ئەگەر بزانیت کە (خوای گەورە ) هەموو شتیکی بەئەندازەو پیوانیە هیچ شتیکی لی وون نابی بە توانایە ،داریژەروە و دانایە و بە هیزەو بە توانا بی هاوتایە بی کۆتایە و زانایا بە سەر هەمووشتیکدا ،شارە زایە بەسەر هەموو ووردەکاری هەموو شتیك دا ،بە توانایە بەسەر هەموو شتیك دا هیچ ماندووی ناکات ،دەسە هەلات داریە کی بی وینەی هەیە ، بیسەرو بینەرە بەسەر هەموو شتیك دا ، بە توانایە بەسەر هەموو توانایە ك دا ، دەولە مەندە بەسەر هەموو درست کراوەکانی دا ، بەلکو دروست کراوەکانی پیویستیان بە زاتی (اللّٰه) یە ، کار بەجی یەو لیزانە بی هەل و کەم کوری لە کارە کانی دا ، لی خۆشبوو و لی بووردەیە لە بەندە کانی دا ، چاودیر رو زانایە بەسەر بەندە کانی دا ، نەرم چاکە کارە لە گەل بەندە کانی دا ، جی مەبەست و جی نیازە لە هەموو پیویستیەکان دا ،چاکە کارو بە بەزەیەی لە گەل بەندە کانی دا ، زۆر میهرە بانە بەرامبەر بە بەندەکانی دا ،پاشاو خاوەن شکۆی تەواوە لەملك و سامانی دا بی کەم و کوری ، یەك و تەنهاو تەنها لە زاتی دا ، توانایی زانستی دەوری هەموو شتیکی داوە ، بەخشەری رزق رۆزیە هەموو درست کراوە کانیەتی ، روون کردنەوەی حەق و ناحەقە وفەرمانرەوایە و دادپەروەرە ، جوانیەکەی بی سنوورە لە زاتی و سیفاتی دا ، بەخشەرەو ، یەکەمە و دیارو ئاشکراەیە و گەورەو بەرز و بلندە ، پاریزە ری زەوی ئاسمانەکانە ئەویش (اللّٰه) بە ناوە جوانە کانی ...هیتد

ئیتر ئەگەر (خوای گەورەت ) بەشیوەیە ناسی و یانی زانینی دڵ بۆ دورست کەرەکەی کە ئەو وابەستیەتی یان باوەری پیکردو متمانەی لەسەر بوو ئەوا ەبیت پشت بە خوا ببەستیت بە زانینی دڵ زانینی عەقل و ژیری و هۆشمەندی خۆی کە چۆن خوای گەورە دە ناسیت یان زانینی بە دەسە هەلات و گەورەیی خوا ئەو کاتە متمانە زیاتر دەبیت وابەستەی پشت بە خوا بەستن بەهیزترو بە تین تر دەبیت بە (اللە تعالی ) ..!!

بۆ روونکردنەوەی ئەم باسە دەڵین : مادەم لە سەر بەندە دەبێت پشت بە ستوو بێت بە (خوای گەورە) ، بۆ فێر بوون لەم پرسانەی خوارەوە دەبێت کاریان پێ بکەین کە ئەم خاڵانەی خوارەوە لە خۆ دەگرێت:

### ١–ناسینی پەروەردگار بە ناو سیفاتە جوانە کانی :

لە سەر هەر بەندەیەك پێویستە پەروەردگاری خۆی بناسێت بە ناو سیفاتە جوانە کانی ، وە بزانێت تواناو دەستەڵاتی پەروەردگار چەندە ..؟!وە بزانێت کە پەروەردگاری بەسە بۆ پشت و پەنا ، وە بەندە بزانێت کە پەروەرگاری هەسوورێنەری هەموو بوونەوەر لە کارو کرداری دا بێ ئەوەی پێویستی بە هیچ شتێك هەبێت وە هەموو کەسێك و هەموو شتێك پێویستی بە پەروەردگارە ..؟!وە بەندە دەبێت بزانی کە پەروەردگار بە توانایە بە سەر هەموو بە توانایەك هەرگیز بێ دەست هەلاتی رووی تێ ناکات ..؟!دەبێت بەندە بزانێت کە پەروەردگاری زۆر مەزن گەورەیە لە هەموو گەورەیەك گەورەترە بەدەسەلاتە ..؟!وە دەبێت بەندە بزانێت کە پەروەردگاری ژیانی بێ کۆتایە هەر هەبووە هەریش دەبێت ئەو زاتە یەکەمە پێش هەمووشتێك وە دوایەمینشە دوا هەموو شتێك هەر دەمینێ ..؟! وە دەبێت بەندە بزانێت کە پەروەردگاری هەرگیز ناخەوێت ،هەرگیز ماندوو نابێت ،هەرگیز هیچ شتێکی لێ وون نابێت ،هەرگیز هیچ شتێکی لە بیر ناچێت ..؟!

بەلی کاتێك بەندە ئەو ناو سیفاتانەی پەروەردگاری زانی ئەوا پەر وەردگاری خۆی دەناسی ، وە پشتی پێ دەبەستی ،وە حەقی پشت بەستنەکەی دەدات ، وە باش دەزانی کە چۆن ملکەچی فەرمانەکانی پەروەردگاری بە تواناو بەڕێزو عزیز بێت ..!!

### ٢– پێگەی خۆی بچەسپێنی لە ڕێگای یەك خوا پەرستی :

ئەگەر یەك خوا پەرستی بەدەست هات ، ئەوا ئەو کاتە پشت بەستن هاوبەشێکی گەورەی یەك خوا پەرستیە ، کە (خوای گەورە) دەفەرموویت:﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ .[٧٨] واتا: جا ئەگەر ئەوانە لە گەل ئەو هەموو دلسۆزیی و میهرەبانیە ی تۆدا ، هەر پشت هەلکەن و گوێت بۆ نەگرن ، ئەوە ئیتر تۆ بلی : من خوا بەسە یارو یاوەرم بێت ، کەپشتگیرو یاریدەدەرم بێت ، هیچ خوایەك نیە جگە لەو زاتە ،هەر پشت بەو دەبەستم ،ئەو زاتەش پەروەردگاری عەرشی گەورە یە ..!!

بێ گومان بەسە بۆ (خوای گەورە ) پشت پێ بەستن و یەك خوا پەرستی ..!!

---

[٧٨] - سورة التوبة (١٢٩) .

### ٣- متمانەپی کردن و واپەستە بوونی بە (خوای گەورە ) لە هەموو بارودخیکدا لە هەموو کاریکدا:

وە ئەم کارانەش نابیت کە هەندیك لە نەفامەکان ، لەکاتیك دا پشت بە خوا دەبەست بی هۆکارە کان ، وە لە کاتەدا کە هۆکارە کان بوونی هەیە ، بەلام پشت گویی دەخەن یان لە بیری دە کەن ، کەچی پەیوەندی بە هۆکارە کانەوە هەیە ..!!

### ٤-گومانی باش بردن بە (خوای گەورە ) :

کەواتە کەی بەندەی ئیماندرا پشت بە پەروەردگاری خۆی دە بەستیت ، کە گومانی باشی پی هەبیت ، وەکودەزانین پشت بەستن (بەسە ) بۆ ئەوەی بە پەروەردگاری خۆت ببەستیت ، نابیت دڵ ی خۆت تیکەلاو بکەیت بە پشت بەستن بە شتیك کە هیچ توانای نەبیت یان پرو پوچ بیت ، وە گرنیگی پی نادات بە شداری کردن دونیا بەریوەبردنەکەی ، چونکە متمانەی بە خوای گەورە یە ، وە دەبیت بارودخی وەك بارودخی ئەو مرۆڤە وایە کە پاشایەك دەرهەمیکی پیدا دواتر دزی لی کرد..!! پاشا کە ووتی : من چەند هەندەم هەیە و گرنیگی پی نادەم ، کە هاتیت لە ناو گەنجینەکەم چەند هەندی ترت پیدەدەم ..؟!هەروەك دەزانین کە (خوای گەورە ) پاشایی هەموو پاشاکانە وە گەنجینەو خەزینەی پرە و پرە هیچی لی کەم ناکات ..؟! جا کەوانە هیچ خەمت نەبی رارامەبە ئەگەر شتیکت لە دەست دا ..!!

وە لە فەرموودەیەکی (القدسی ) دا هاتووە : (( أنا عندي ظن عبدي بي )) .[٧٩]

واتە : من لە گەل گومانی بەندەی خۆمم ..!!

وە گومانی باش بردن بانگیشەیە بۆ پشت بەستن بە (خوای گەورە ) وە پشت بەستن بە خوا دەست پکیکە بۆ گومانی باش بردن ..!!

[٧٩] - رواه البخاري (٧٤٠٥) ، ومسلم (٢٦٧٥).

### ٥-ملکەچی دڵ بۆ (خوای گەورە ) :

ئەگەر ملکەچی وەك ملکەچی زەلیلی بەندە بۆ گەورە کەی خۆی رزگاری بکات ، ئەوا پشت بەستن روودەدات ..!!

### ٦- راسپاردە یان پی دەست پیرم :

کە (خوای گەورە ) لە سەر زمانی ئیمانداران لە ال فرعون دە فەرموویت :

﴿فَسَتَذْكُرُونَ مَا أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ﴾ .[٨٠] واتە: جا لە ئایندەدا رۆژێك دیت ، ئەم قسانەی منتان دیتەوە یاد ، ئیستاکەش من خۆم و کارو بارەکانم دەدەمە دەست خواو پشت بەو دەبەستم ..!!

وە لە (کوری مسعوود ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : گەورە ترین ئایەت لە قورئانی پیرۆز دا راسپاردە یان پی سپیردراوە ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾.[٨١]

لە (ابن القیم) – رەحمەتی خوای لی بیت– ئەویش لە (شیخی ئیسلام ابن تیمیه) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : ( ئەو قەدەرانەی ئادەمیزاد روو بەروویان دە بیتەوە دوو فەرمان لە خۆ دە گرن : پشت بەستن لە پیشەوە و ،رازی بوونیش لە دوایەوە ، هەر کەس پیش کارە کە پشتی بە خوا بەست و دوای کارە کەش رازی بوو بە سەرئەنجا و بریارەبراوە کان ئەوا ئە و کەسە بە کاری بەندایەتی هەستاوە ) .[٨٢]

وە هاوشیوەی ئەم فەرموودەیە ی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە دوعاو نزای (الاستخارە ) کە دەفەرمووی : ((وأقدر لي الخير حيث كان ثم أرضني به )) .[٨٣] واتە: ئەوەی چاك و خیرە بۆم دیار بکە ، لە گەل ئەوەی لەسەری لیم رازی بی ..!! پشت بەستن و راسپاردە کردن بە خوا پیش روودانی رووداوە کان رازی بیت ، وە پاش روودانی رووداوە کان رازی بیت ..!!

[٨٠] - سورة غافر (٤٤).
[٨١] - المعجم الكبير ص (١٣٣).
[٨٢] -ابن القيم مدارج السالكين (١٢٢/٢).
[٨٣] - رواه البخاري برقم (١١١٦) .



٧- جیگر كردنی هۆو هۆكاره كان ،ئەوە نابیت وازی لە بهینی چونكە گاریگەری هەیە لە سەر دەروون :

هەر كەسیك نەری یان ئینكاری لە هۆكاره كان یان كاریان پی نەكات ،ئەوا كەسیكی گیل و شیتە ..؟! وە هەر كەسیك متمانە و باوەر بە هۆكاره كان بكات ، بی ئەوە متمانە باوەر بە (خوای گەورە ) بكات ، ئەوا تەنها پشت بە هۆكاره كان ببەستیت ، ئەوا هاوبەشی داناوە و شریكی ئەنجامدا ..؟! دەبیت پیش جیگری كردنی هۆكارەكان متمانەی تەواو بە خوای گەورە بیت پشتی تەواو بە خوا گەورە ببەستی ، ئینجا جیگیر كردنی هۆكاره كان و متمانە كردنی پیان ..!!

لە ( ئەنسی كوری مالك ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : (( قال رجل : یا رسول الله (صلى الله علیه وسلم ) أعقلها وأتوكل ، أو أطلقها وأتوكل ..؟! قال: اعقلها وتوكل )) .[٨٤] واتە: پیاویك ووتی : ئەی پیغەمبەریخو (صلى الله علیه وسلم ) ووشترەكەم ببەستمەوە و پشت بە (خوای گەورە ) ببەستم ،یان بەرەلای بكەم و پشت بە (خوای گەورە ) ببەستم ، پیغەمبەری خوا (صلى الله علیەوسلم فەرمووی : ووشترەكە ببەستوە ئەو كاتە پشت بە (خوای گەورە ) ببەستە ..؟! ئەم بەلگەیەكی جیگیر لە هۆكاره كان ..!!

هەندیكجار رەنگە مرۆڤ هۆكارەكان نەدۆزیتەوە ، بەلام تەنها دوعاو نزا كردن ، نیعمەتی هەموو هۆكارەكانە.

[٨٤] - سنن الترمذي برقم (٢٥١٧).



وە (خوای گەورە ) ئەوزانیاریەی هۆكارە كانی داوە تەوە بە بەندە كانی خۆی ، هەروەك دەفەرمووێت : ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾ .[٨٥] واتا: هەر ئەو زاتە زەوی بۆ زەلیل و ملكەچ كردوون ، هەر چیتان بویت لەسەری دروست دەكەن ، چۆنتان بویت بە كاری دەهینن ، بگەڕین بە هەموو گۆشەو كەناریك دا ، لەو رزق و رۆزیەش بخۆن كە پیشكەشتان دەكات ، دلنیاش بن كە سەر ئەنجام گەرانەوە تان بۆ لای ئەو زاتە یە ..!!

هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ .[٨٦] واتا: جا كاتیك نویژ تەواو بوو ، ئەوا بلاو ببنەوە بە زەویدا و بە تەمای بەخششی خوا هەول و كۆشش بكەن ، یادی خوا زۆر بكەن لە هەموو چالاكیەكانی ژیاندا با ناوی ئەو زاتە لەسەر زارو لە نا دلّ تاندا بیت ، بۆ ئەوەی سەرفرازیی هەمیشەیی بەدەست بهینن ..!!

وە (ئیمامی احمد ) – رەحمەتی خوالی بیت – (پرسیاری كرد لەوان كە دەلین ئیمە پشت بەخوا دەبەستین ئیمە لە پشت بەستووەكانین ، وە دەلین : دادەنیشین وە رزق و رۆزیمان لەسەر خوایە ..؟؟!! وە ( ئیمامی احمد ) وەلامی ئەوانەی دایەوە ووتی : ئایا ئەوە (خوای گەورە ) نیە دەفەرمووێت : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ . واتا: ئەی ئەوانەی باوەرتان هیناوە كاتی كە بانگ درا بۆ نویژ لە رۆژی هەینیدا ، ئیوە بە پەلە بچن بەدەم یادی خواوە و واز لە كرین و فرۆشتن بهینن ، چونكە ئەو كارەتان چاكترە بۆتان ئەگەر بزانن و تیبگەن ..!!

واتا: جا كاتیك نویژ تەواو بوو ، ئەوا بلاو ببنەوە بە زەویدا و بە تەمای بەخششی خوا هەول و كۆشش بكەن ، یادی خوا زۆر بكەن لە هەموو چالاكیەكانی ژیاندا با ناوی ئەو زاتە لەسەر زارو لە نا دلّ تاندا بیت ، بۆ ئەوەی سەرفرازیی هەمیشەیی بەدەست بهینن ..!! .[٨٧]

[٨٥] - سورة الملك (١٥).
[٨٦] -سورة الجمعة (١٠).
[٨٧] - تلبيس إبليس (٣٤٨).



# ئەو كارە قەدەغەكرا وانەی كە پشتی پی دەبەستن

## یەكەم : بالندە و رەشبینی كردن پی :

بالندە و رەشبینی كردنە لە سەری ، ئەوە یە كە پیاویك شتیك ببینی یا ببیستیت ،ئەوا رەشبین بی پی ، مە بەستەكەشی ئەوە بیت كە لی بكۆلیتەوە ئەویە هۆكارە كەی كە بینیویەتی یان بیستویەتی ، بۆ ئەوەی پیویست نەبوو ببیت بۆ ئەوەی لە سەر كارەكەی بەردەوام بیت ، بەهۆی ئەم هۆكارەوە ،ئەویش بینینی یان بیستنی بالندەیە كە رەشبینی تیدا بەدی بكات ئەو یەكیكە لە قەدەغەكراوە كان ی پشت بەستن پی ،چونكە ناكریت بە هۆی هەلفرینی بالندە بهاتنە ریگا ئاژەلیكی كیوی ئەو رەشبین بیت پی ،ئەم رەشبینە بكەیتە یەكیك لە هۆكارە كان ، چونكە ئەو كارانە لە سەر دەمی نەفامی دا هەبوون ، بەهۆی فرینی بالندە كاریان ئەنجامدەدا یان هەرشتیك كە تیكەلەیەك بوو لە خورافات لە سەردەمی نەفامی دا ..!! چونكە فرینی بالندە متمانەكردن پی ئەوا ریك پیچەوانەی پشت بەستنە بەخوای گەورە ،چونكە دڵ وابەستە بووە بە پشت بەستن بە خوا ، ناكریت پیاویك بەم خورافاتانە هەلخەلە تیت ، یان بۆ ئەوەی بیەویت پیاویكی یەك چاو ببینی ، یان بالندەیەكی بەفری بەرەو باكوردا ، یان كورسیەكەی شوینی دانیشتن لە ناو فرۆكە دەبیت ژمارە (١٣) بیت یان بی ژمارە (١٣) شۆمە رەش بینیە ، یانیەكیك لە رنگەكان بە شووم و رەشبینی دابنی ،یان ژمارەی سالە كان ، هەرشتیك كە بیجگە لە (خوای گەورە ) پشتیپی ببەستی ، ئەوانە هەر هەمووی پیچەوانەی پشت بەستنە بەخوای گەورە ، هەر هەمووشی قەدەغەكراوە ..!!

هەروەك پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە فرینی بالندە ئاگادارمان دەكات كە دەفەرموویت : (( ولا طيرة )) .[88] واتە : فرینی بالندە شووم و رەش بینی تیدا نیە ..!!

بەلی فرینی بالندە رەش بینی بە تەنها پچیەوانەی پشت بەستن بە خوای گەورە نیە ، بەلكو پیچەوانەی یەخوا پەرستیە پیچەوانەی رەستەی (لا إله إلا الله ) واتە : پیچەوانەی (توحید ) ..!!

[88] رواه مسلم (٢٢٢٠).

## دووەم : ئەستێرە ناسە كان و فەلك ناسە كان :

بی گومان ئەو كارانەش قەدەغەكراوە كە پێچەوانەی پشت بەستن بە خوای گەورە یە ، كە چوونە لای ئەستێرە ناسە كان یان فەلك ناسە كان یان فال گرەوە كان یان ئەوانە بوورج دەگرنەوە یان ئەوانەی كە قاوە دەگرنەوە یان دەلێن وەر بەختی خۆت تاقی بكەورە لە لامان یان ئەوانەی دەلێن ئیمە لە شتە پەنا هەكان دەزانین واتە: (غیب ) یان ئەوانەی كە دەلێن ئیمە دەزانین ئاینده چۆن دەبێت چی روو دەدات ،یان ئەستێرە ناسە كان ئەلێن ئیمە لە غیب پەناهیەكان دەزانین سالی دادی ئەم رووداو ئەمەدەبێت ، هەر بۆیە ئەگەر بەندەی ئیماندە پەشت بەخوا ببەستێت و حەقی پەشت بەستنەكەی لەسەر (خوای گەورە) ئەوا هەرگیز متمانەو پشت بەستن بە جۆرە كەسانەناكات جگەلە (خوای گەورە ) نەبێت ، وە داوا و یارمەتی ناكات جگەلە (خوای گەورە ) نەبێت ، چونكە ئەوانە هیچ لە غیب پەناهیە كان نازانن ،تەنها بانگەشە دەكەن ئەویش بانگە شە كەیان لە شەیتانەكانەوەیە ، زانست زانیاری دانایی و توانایی بەسەر هەمووشتێك دا هەر لە خواوەیە ، زانینی هەمووشتێك هەر خوای گەورە زانایە بەرووداوە كانی ئاینده ..!!

لە (شیخی ئیسلام ابن تیمیە ) – رەحمەتی خوای لە سەر بێت – دەلێت : ( كاتێك  (علی كوری ابی تالیب ) خۆی ئامادەكرد گشت بكات بۆ جەنگ كردن یان كوشتار كردن لە گەل خواریجەكان ، ئەوا (منجم ) پێشنیاری كرد ووتی : ئەی ئەمیری باوەردارانە گەشت مەكە مەرۆ ..!!چونكە (مانگ لە عقرب دایە)  ئەگەر گشت بكەی كە (مانگ لە عقرب دایە ) ئەوا ئەوان هێرش دەكان تۆ شكست دەهێنی ، بە لام هەروەك (علی كوری ابی تالیب ) ووتی: من گشت دەكەم دلنیام لە خوای خۆم ،وە پشت هەر بەو زاتە دەبەستم ، وە تۆش درۆ دەكەیت ، گشتی كرد بۆ كوشتاری خواریجەكان ئەوە بەرەكەت كەتە سەر گەشتەكەی كوشتاری خواریجەكانی كرد  هەتاكو هەر هەمووی كوشتن ، وە ئەوش گەورە ترین نیهنی بوو كە كوشتاری خواریجەكانی كرد بە فەرمانی پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) .[٨٩]

تەنانەت ئەگەر ئیمانداریك گوییی بیستی هەوالیكی ،فەلك ناس یان ئەستێرە ناس بوو ، ئەگەر هەواله كە خێریش بوو یان هەر هەمووشی خێر بوو ، وە نابێت باوەریان پی بكات و چونكە پیچەوانەی پشت بەستنە بەخوای گەورە ، وە نابێت هیچ  راچاوی  یان ئەعتباری بە قسە كانی بكات  ...؟؟؟!!!

[٨٩] - ابن تيمية الفتاوى الكبرى (٥٧/١).



## سی یەم : نووشنە هەلواسین یان نووشتە پیوە کردن بە مل :

بی گومان ئەم کارانەش کە قەدەغەو پیچەوانەی پشت بەستنە بەخوای گەورە ، هەر وەك زۆریك لە نەفامەکان ئەم کارە ئەنجام دەدن لە ئیستاش دا هەر ماوە ، دەبینین پەرۆیەك یان شتیکی وەك نووشتە هەلدەواسن بەمل و سینگیان دا ،یان بە سەیارە کەیان وەدەکەن یان بە مەرو مالات و ئاژە لە کانیان وە دەکە ئەم بۆ ئەوەی بەرگری بکات لە زیان پی گەیان و ،حەسوودی چاو زاری خەلکە ، لە راستی دا ئەوانە هەرهەموشتیکی بی سوود و پرو پوچن نەسوودیان هەیە نەزیان بۆ خاوە نەکانیان ،هەر هەمووی پرە لەخورافیات ،یان بۆ ئەوەی رزق رۆزی پی زیاد بکە ،یان لە ملی نەخۆشەکانیان دەکەن ، بەلی ئەو نووشتە وەرقانە یان پرۆیانە دەهینن لەلای جادوو گەرەکان دەجالە کان ،مەبەستیان ئەوەیە کە چادیریان دەکات لە بەلا و نەهامەتی حەسوودی نەخۆشی یارمەتیان دەدات ، کەچی پیچەوانەی پشت بەست بە خوای گەورە پیچەوانەی یەك خوا پەرستی ووشەی (لا إله إلا الله ) (توحيد ) ..؟!!

پرسیار ئایا پشت بەست بە خوا لە کوی..؟!! لە کاتیك دا ئەوانە کارو کردەوە یانە کە پیچەوانەی شەرع ئایینی خوای گەورەیە ..!! بیگومان ئەوانە سزای خۆیان وەر دەگرن لە سەر ئەنجامدانی تاوانانەی کە پیچەوانەی شەرعی (خوای گەورەیە) ..!! لە (عكيم بن ابى معبد الجهنى ) – خوا لی رازی بیت– دەلیت : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی (( من تعلق شيئا وكل إليه )).[٩٠] واتە : هەرکەسیك شتیك هەلواسیت بەخۆیدا ئەوا دەدریتە دەست ئەو شتە یان بەو شتە دەستپیردری ..!! وەکو ئەوەی بەرەنگ یان مەرەکەب لەسەر وەرقە یان هاوشیوە ئەو ، ئەوا پشتی بە خوا نەبەستووە ، لە کاتیك دا پەرۆ یان نووشتەی هەلواسیوە ، دەلیت پشت بەخوا دەبەستم ، ئەوا پشتی بەم هەلواسینە بەستووە خۆی بەم سپردووە ، ئەو هەلواسینە بەسە بۆ ئەو جۆرە کەسانە کە لە زەرمەندی دونیا دواژۆ دان ..!!

---

[٩٠] - سنن الترمذي (٢٠٧٢)

## چوارەم : پەنا بردن بۆ دارو بەرد:

پەنا بردن بۆ دارو بەرد هەر هەمووی قەدەغەکراوە جائز نیە  پە نای بۆ ببەی ، هەمووی پیچەوانەی پشت بەستنە بەخوای گەورە ، وە هەر کەسیك پەنا بۆ دارو بەرد ببات ، ئەو پەنا بخوا هاوبەشی داناوە بۆ خوا شرکی کردووە (پەنا بەخوا ) .

## پینچەم : نە گەران بەدوای دواکردنی رزق رۆزی دا :

ئەوە بوو لە پیشا باسمان کرد ، لە کاتی پشت بەستن پیویسمان بە هۆکارە کانەوە هەیە ،ئینجا پشت بە خوای گەورە دەبەستین ، وە ئەوەش مەرجیکە لە مەرجەکانی پشت بەستن بە(خوای گەورە ) ، وە ئەگەر نەری لە هۆکارە کانەوە بکەیت ،واز لە هۆکارە کان بهینین ، ئەوا پیچەوانەی پشت بەستنە بە (خوای گەورە ) ، وە بی گومان ئیمە دەدوینە لەسەر ئەم باسە کە ئیستا لەم سەردەمەدا و لەم زمانەدا چ کارە ساتیك و نەهامەتیەك بلاو بۆیتەوە ، ئەوەش بلاو بوونەوەی بی کارو کاسبی ، زۆریك لە خەلکی پشتیان بە ستووە بە کەسانی تر بۆ دوا کردنی رزق رۆزی ، وە کو  : کور پشتی بە باوکی بەستووە بۆ رزق رۆزی ..؟!، وە برا پشتی بە خوشکە فەرمانبەرە کەی بە ستووە بۆ زرق رۆزی..؟! وە برا پشتی برای بەستووە بۆ رزق رۆزی ..؟! کەسیك لە شوینیك دا بەجی ناهیلی پشتی بە خاوەن کارە کە دەبەستی بۆ رزق رۆزی ..؟! یان فەرمانبەرە پشتی بە فەرمانگەکە دە بەستی بۆ رزق رۆزی..؟! وا بیر دە کاتەوە ئەگەر دەر کرا ئەو رزق رۆزی نامینی لەسەر زەوی جگە لەم شوینەی تیدا بوو ..؟! یان سەربازە پشتی دە موچەکەی بەستووە وادەزانی ئەگەر ئەوە نەما رزق رۆزی نامینی لەسەر زەوی بۆی ، یان کەسیکە بەدوای رزق رۆزی ناگەریت هەدەست لەم و لەو پان دەکاتەوە ..؟!! هەمووی ئەمانە نەری کردنی هۆکارە کانە ، کەواتە پیچەوانەی پشت بەستنە بە (خوای گەورە ) وە نەگەرانە بەدوای رزق رزۆی حەلال ..؟! وا دیارە ئەم دیاردانەی کە باسمان کرد هۆکارە کەی ئەوەیە سستی تەمبەل و خۆ دینەوە یە لە گەران بەدوای رزق رۆزی وە پشت بە خۆیان نابەستن بە لکو پشت بە کەسانی تر دەبەستن جگە لە خوای گەورە ..؟! بەلکو گەنجانی ئیستا  ناگەرین بەدوای کاریکی بەرهەم دا ، بەلکو کاریکیان خۆش دەویت تیدا بینەوە هیچ بەرهەم وماندوو بوون جهدی حەقیقی دروستی نەبیت ..؟! ئەوە ش ئەوە دەگەیەنی بیکاری باشترە بۆیان لەوەی کە هەول جهدی تیدا نەبیت بۆ گەران بەدوای داوا کردنی رزق رۆزی دا ..؟!

وه له قورئان و فه‌رمووده كان دا هاتووه كه چه‌ندین جۆری ریگا هه‌یه بۆ كارو كاسبی كرد و دوا كردنی رزق رۆزی ،ئیستاش هه‌ندیك ئاگادار كردنه‌وه و بابه‌تی كارو كاسبی  به‌بیر ئه‌و كه‌سانه‌ی كه ته‌مبه‌ل و بی كارن ده‌هینینه‌وه :

١–گه‌وره ترین هۆكار بۆ داوا كردنی رزق رۆزی ، ئه‌وه‌یه حه‌لال ترینه له‌سه‌ر زه‌وی ئه‌ویش غنیمه‌ت له جه‌نگ دا یان له جیهاد كردن دا له پیاوی خوا دا  :  كه (خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویت : ﴿فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَالًا طَيِّبًا﴾ . [٩١] واتا : كه‌واته بخۆ له شتانه له غنیمه‌ت ده‌ستان كه‌وتووه به‌حه‌لالیكی پاك باش ..!!

وه له (عبدالله كوری عمر ) – خوا لی رازی بین = ده‌لیت : پیغه‌مبه‌ری خوا (صلی علیه وسلم ) فه‌رموویه‌تی : (( وجعل رزقي تحت ظل رمحي )) .[٩٢] واته : رزق رۆزی به‌ده‌ست بینه ئه‌گه‌ر له ژیر سیبه‌ری ره‌مه‌كه‌ت بیت ..!!

٢–كار كردن به‌ده‌ست : پیغه‌مبه‌ری خوا (صلی الله علیه وسلم ) فه‌رمووی :(( ما أكَلَ أحَدٌ طَعامًا قَطُّ، خَيْرًا مِن أنْ يَأْكُلَ مِن عَمَلِ يَدِهِ، وإنَّ نَبِيَّ اللَّهِ داوُدَ عليه السَّلامُ، كانَ يَأْكُلُ مِن عَمَلِ يَدِهِ)) .[٩٣] واته:هه‌رگیز كه‌س خواردنی نه‌خواردوه ،خیرتر له‌وه‌ی كه به‌كارو ده‌ست و بازووی خۆی بی خوات ، وه پیغه‌مبه‌ر داود (علیه السلام ) به كاری ده‌ست بازووی خۆی خواردنی خواردووه یان رزق رۆزی په‌یدا كردووه ..!!

---

[٩١] - سورة الانفال (٦٩).
[٩٢] - رواه احمد برقم ( ٥٠٩٤) و صححه الالباني .
[٩٣] -رواه البخاري برقم (٢٠٧٢).

٣–بازرگانی کردن :ئەو کارەش زۆریك لە کۆچ کەران و ئەنصارە کان لە سەردەمی دەولەتی ئیسلام لە شاری مەدینە دا ئەنجامیان دەدا ،وەك (عبدالرحمن کوری عوف ) کە مال و سامانی خۆی بە قەد نیوەی مال و ساکانی هەموو ئەنصارە کان بوو ،کاتیك کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە ، یەکسەر ووتی : بە کەسیك بازرای شاری مەدینەم پی نشان دا یان بازاری مەدینە لەکویە ؟! ((دلونی علی السوق )) [٩٤].

٤–کوشت وکال کردن کیلان و چاندنی زەوی زار : وە ئەوش کاریکە لە کارە گرینگە کان بۆ داوا کردنی رزق رۆزی و پشت بەستن بە خوای گەورە ، ئەوەش دەبیت پشت بەخوا ببەستیت جگە لەو زاتە پشت بە هیچ شتیکی تر نەبەستیت ..؟! وە دەبیت وابەستی خوای گەورە بیت ، چونکە چاندنی دانەویلە کیلانەی زەویە کە ئاودانی ئەو پیوەندی بە خوای گەورە هەیە بۆ بەرهەم هینانی چونکە لە توانا و هیزو دەسەلاتی خوای گەورە یە کە بەرهەمی هەبیت یان نەی بیت ،ئەوە ش دەگەریتە بەر ویست مشئیەتی خوای گەورە ، کە بەرهەم دار بیت یان بەرهەم دار نەبیت چوکە چاودیری کردن بەرهم دار کردنی هەزەویەکی کوشت وکال ئەوا لە مشئەتی خوای گەورە دا تەنها ئەو زاتە توانا هیزو دەسەلاتی هەیە کە باران ئاوی زەویە کەی بەپیت بەرەکەت بکات ..! !وە هەندیك لە جوتیاران یان ئەوانەی بەرهەمی کوشت وکالی بەرهم دەهینن، دەچنە ناو کیلگە کوشت و کالیە کانیا دەبینی بە هۆی زیندەور عەشەرات و کلەو شتی تری لە نا چووە بەرهمی نیە زەویە کوشت کالیە کایان ویران بووە ، یان بەهۆی زۆری باران یان بی بارانی یان بەهۆی بەفر شەختەوە زەویە کەیان ویران بووە ، ئەوە ش دەبیت لە کاتی چاندنی پشت بە خوا ببەست بۆ ئەوەی بەرکەتی بەکەویتە ناو بەرهەمە بەرووبوومە کوشت وکالیە کەیان ،بی گومان دەبیت هەولی بەدەست هینانی رزق رۆزی بدەین بۆ ئەوەی خوای گەورە برەکەت رزق رۆزی بی ژمار برژینیتە بەسە رئیماندران خواناسان .

[٩٤] –رواه البخاري برقم (٥٠٧٢).



## شەشەم: نەگەران بەدوای چارەسەر نەکردن :

بی گومان ئەم کارە تەواو پیچەوانەی پشت بەستنە بە (خوای گەورە) کە نەگەران بەدوای چارەسەر نەکردن ، چونکە بیگومان لە سروشت دا تووشی نەهامەتی در دو نەخۆشی دەبیتەوە ،دەر دوو نە خۆشی پیویستی بە چارەسە رکردنە ، کەسیك نەخۆش دەکەویت دەبیت یەکەم چارە درمان و دەوا بۆ چارە سەری نەخۆشیە کەبدۆزیەتەوە ئینجا پشت بەخوا بە بەستیت کە درمانی لایە شیفاشی لایە ،بەلام ئەو سروشتی ژیانی دونیا یە دەبیت بگەری بەدوای چارەسەری نەخۆشە بۆ ئەوەی درمان دەوای بۆ بدۆزیتەوە ئینجا دوعا بکەی لە (خوای گەورە ) بۆ ئەوەی شفا بۆ نەخۆشیە کە رەوانە بکات ئینجا پشت و پەنای تەواوی بە خوای گەورە بیت یەقین باوەری هەبیت کە تەنها شیفای نەخۆشیە کە بەدەست ئەو چارەسەری نەخۆشیە تەنها ئەو زاتە ، دەبیت متمانەی تەواومان بە (خوای گەورە ) هەبیت چونکە چارەسەرو درمانی نەخۆشەیە کە و شیفا تەنها بەدەست ئەوە ،وە ك لەم سەردەمەدا بەناوی جیاجیا چارەسەری بۆ نەخۆشەکان دەکان ئەلین شفای دراوە لە سەر دەستی ئیمە نەخیر ئەمانە تەنها بۆ بازرگانی ئەم کارە دەکەن ،یان ئیستا پزیشکی نەزان پەیدا بووە دەبیت بۆ چارەسەکردن خۆمان لەم جۆرە پزیشکانەبپاریزین چونکە دەرمانی دەوای خراپ بەسەر چوو دەن بە نەخۆشە کان ، بی گومان دەبیت بەدوای چارەسەری باش دا بگەرین پشت بەخوا ببەستیت بۆ شیفای نەخۆشەکانمان ،هەروەك پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) ەدەفەرموویت : (( م أنزل الله (عز وجل ) داء إلا أنزل له شيفاء )) .[95] واتە : (خوای بەرزو بلند ) درمان دەوای نرەوانەی خوارەوە کردووە ،لە گەل ئەوەش شیفای رەوانە کردووە ..!! لە ( ئەسامەی کوری شريك ) – خوالی رازی بیت – دەلیت : هەندیك الاعرابی ووتیان :ئەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليەوسلم ) ئایا چارە سەری خۆمان بکەین ..؟! فەرمووی : ((نعم يا عبادِ اللّه تداوُوا ، فإن اللّهَ لم يضعْ داءً إلا وضعَ له شِفاء – أو دواء – إلا داءً واحدا ، فقالوا : يا رسولَ اللّهِ وما هُوَ ؟ قال : الهرمُ)) .[96] واتە: فەرمووی : بەلی ،ئەی بەندەی خوا چارەسەری خۆتان بکە داو دەرمان بەکاربهینن ،ئەوەش بزانن (خوای گەورە ) هەر دەردیکی دانابی شیفاو دەرمانیشی بۆ داناوە ، یان فەرمووی : جگە لە یەك نەخۆش نەبیت ..؟! ئەوانیش ووتیان ئەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) چیە ..؟! ئەویش فەرمووی: ئەوە پیریە ..؟!

---

[95] - رواه البخاري برقم (٥٦٧٨) .
[96] -سنن الترمذي برقم (٢٠٣٨).





## له چیرۆکی پشت پشت بەستوان بە (خوای گەورە)

بی گومان بارودخانەی لەژێر فەرانی بەندە دایە دەبێت هەر هەمووی پشت بە خوای گەورە ببەستیت و ، وە دەبێت دڵ و دەروونی وابەستەی (خوای گەورە ) بکات ، وەئیستا گوی بیستی چەند چیرۆکیکی پیاو چاکان دەبین کە چۆن پشبەستوو بوونە بە خوای گەورە ، وە ئەو نیعەتانەیان بەسەر داهاتووە بە هۆی پشت بەستن و راستگۆیان بەرانبەر بە (خوای گەورە ) وە لە سەرووی هەموو ئەو پشت بەستووانە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) بوو .. ! !

## ✍پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) خاوەنی شمشیرە کە :

لە (جابر کوری عبدالله ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت: ((غَزَوْنَا مع رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ غَزْوَةً قِبَلَ نَجْدٍ، فأدْرَكَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ في وَادٍ كَثِيرِ العِضَاهِ، فَنَزَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَعَلَّقَ سَيْفَهُ بغُصْنٍ من أغْصَانِهَا، قالَ: وَتَفَرَّقَ النَّاسُ في الوَادِي يَسْتَظِلُّونَ بالشَّجَرِ قالَ: فَقالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ: إنَّ رَجُلًا أتَانِي وَأَنَا نَائِمٌ، فأخَذَ السَّيْفَ فَاسْتَيْقَظْتُ وَهو قَائِمٌ علَى رَأْسِي، فَلَمْ أشْعُرْ إلَّا وَالسَّيْفُ صَلْتًا في يَدِهِ، فَقالَ لِي: مَن يَمْنَعُكَ مِنِّي؟ قالَ قُلتُ: اللَّهُ، ثُمَّ قالَ في الثَّانِيَةِ: مَن يَمْنَعُكَ مِنِّي؟ قالَ قُلتُ: اللَّهُ، قالَ: فَشَامَ السَّيْفَ فَهَا هو ذَا جَالِسٌ، ثُمَّ لَمْ يَعْرِضْ له رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ. ﴿وفي روايةٍ﴾: أنَّ جَابِرَ بنَ عبدِ اللهِ الأنْصَارِيَّ وكانَ من أصْحَابِ النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ أخْبَرَهُمَا، أنَّهُ غَزَا مع النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ غَزْوَةً قِبَلَ نَجْدٍ، فَلَمَّا قَفَلَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ قَفَلَ معهُ، فأدْرَكَتْهُمُ القَائِلَةُ يَوْمًا...، ثُمَّ ذَكَرَ نَحْوَ حَديثِ إبْرَاهِيمَ بنِ سَعْدٍ وَمَعْمَرٍ. ﴿وفي روايةٍ﴾: أقْبَلْنَا مع رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ حتَّى إذَا كُنَّا بذَاتِ الرِّقَاعِ، بمَعْنَى حَديثِ الزُّهْرِيِّ وَلَمْ يَذْكُرْ: ثُمَّ لَمْ يَعْرِضْ له رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ)) [٩٧].

واتە: لە (جابری کوری عبدالله ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : لە خزمەتی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەرچووین بۆ غەزایەك ، لە لای نجدەوە تووشی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) هاتین ، لە دۆلیکدا دارو درەختی درکاوی زۆری تیدا بوو ، پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە ژیر داریك یان درەختیك دا دابەزی شمشیرەکەی هەلواسی بە لقیك لە لقە کانی دارەکە یان درەختە کە دا ، دەلی : خەلکیش بلاوەیان کرد لە دۆلە کەدا بۆ بن سیبەری دارو درەختەکان ، پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : پیاویك هات بۆلام من خەوتبووم ، شمشیرەکەی کاتیك بە خەبەر بوومەوە بەسەر سەرمەوە وەستا بوو ، شمشیرەکەی بەرووتی لەدەستی گرتبوواتە : (لە کیلانەی دەری هینا بوو) پی ووتم : کی لەمن دەتپاریزی ..؟! منیش ووتم : (الله) ، جاری دووەم ووتی : کی لە من دەتپاریزی ..؟! دووبارە ووتم : (الله) ، پیغەمبەری خوا فەرمووی : پیاوە کە شمشیرەکە خستەوە ناو کیلانەکەی دا ، ئەوە تا ئیستا دانیشتووە ، دوای ئەوە پیغەمبەری خوا هیچ سزایەکی نەدا ..؟؟!!

ئەوەش پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) خۆی سپارد بە(خوای گەورە) و پشتی بە(خوای گەورە) بەست ..؟!

[٩٧] - صيحيح مسلم برقم (٨٣٤).





## ✍پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە ئەشکەوتەکەدا :

لە (ئەنسی کوری مالك ) – خوا لی رازی بیت –: (ابو بکر صدیق ) روو داوە کەی گێرایەوە دەلیت:

((أنَّ أبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ، حَدَّثَهُ قالَ: نَظَرْتُ إلى أقْدَامِ المُشْرِكِينَ علَى رُؤُوسِنَا ونَحْنُ في الغَارِ، فَقُلتُ: يا رَسولَ اللهِ، لو أنَّ أحَدَهُمْ نَظَرَ إلى قَدَمَيْهِ أبْصَرَنَا تَحْتَ قَدَمَيْهِ، فَقالَ: يا أبَا بَكْرٍ ما ظَنُّكَ باثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا )) .[٩٨]

واتە: (ابو بکر ) دەلیت : تەماشای پی موشریکانم دە کرد لە سەرمانەوە بوون ، لە کاتیکدا لە ناو ئەشکەوتەکەدا بووین ، منیش ووتم : ئەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) ئەگەر یەکیکیان سەری نیوی بکات بۆ بەر پی خۆیان ئەوا ئیمە دەبینی ..؟! پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ئەی( ابابکر ) گومانت چیە بەرانبەر بە دوو کەس کە (خوای گەورە ) سی یەمیان بیت ..؟!

[٩٨] -صحيح مسلم برقم (٢٣٨١).



## ✍ئافرەتەکە و تەنوورە کە:

لە (ابو هريره ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : ((بينما رَجُلٌ وامرأةٌ له في السَّلَفِ الخالي، لا يَقدِران على شيءٍ، فجاءَ الرَّجُلُ من سَفَرِه، فدخَلَ على امرأتِه جائعًا، قد أصابَتْه مَسغَبَةٌ شَديدةٌ، فقال لامرأتِه: أعندَكِ شيءٌ؟ قالتْ: نَعَمْ، أَبْشِرْ، أتاكَ رِزْقُ اللهِ. فاستحَثَّها، فقال: وَيْحَكِ، ابتَغي إنْ كان عِندَكِ شيءٌ، قالت: نَعَمْ، هُنَيَّةً، نَرجو رَحمةَ اللهِ، حتى إذا طالَ عليه الطَّوَلُ قال: وَيْحَكِ، قومي، فابتَغي إنْ كان عندَكِ خُبزٌ، فَأْتيني به، فإنِّي قد بلَغتُ وجَهدتُ. فقالت: نَعَمْ، الآنَ يَنضَجُ التَّنُّورُ، فلا تَعْجَلْ. فلمَّا أنْ سكَتَ عنها ساعَةً، وتَحيَّنتْ أيضًا أنْ يَقولَ لها، قالتْ هي من عند نَفْسِها: لو قُمتُ فنَظَرتَ إلى تَنُّوري. فقامتْ فوجَدتْ تَنُّورَها مَلآنَ جُنوبَ الغَنَمِ، ورَحْيَيْها تَطحَنانِ، فقامتْ إلى الرَّحى فنفَضَتْها واستخرَجَتْ ما في تَنُّورِها من جُنوبِ الغَنَمِ، قال أبو هُرَيرةَ: فوالَّذي نَفْسُ أبي القاسِمِ بيَدِه، عن قولِ محمدٍ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: لو أخَذَتْ ما في رَحْيَيْها، ولم تَنفُضْها لطحَنَتْها إلى يَومِ القيامةِ )).[99] واتە: پیاویك و ئافرەتیك لە رابردوو دا لە سالانی پیشوودا ، لە مالەوە هیچیان نابیت و هەژار دەبن ،پیاوە کە لەسەفەر دەگەریتەوە مالەوە ،بەبرسیەتی دەچیتە ژوورەوە لای خیزانەکەی ، برسیەتی تەنگی پی دەچنیت هاواری لی هەردەستی ،دەلی بە خیزانەکەی هیچ شتیك لە مالەوە هەیە یان هیچ شتیك هەیە بی خۆم ..؟! ئافرەتەکە دەلیت : بەلی مژدەبی (خوای گەورە ) زۆری بۆ ناردووین ، دوو بارە پیاوە کە پەلەی لە ئافرەتەکە کرد ،دەلیت هاوار بۆ تۆ هەولبدە شتیکم بۆ بینی بی خۆم یان شتیکت لا هەیە ..؟! ئافرەتکە دەلی : بەلی . بەلام کەمیك بووە ستە..!! (بەلی ئافرەتە کە بە هیوای رەحم و بەزەی خوای گەورە بوو ) هە تاکو کاتەکە دریژەی کیشا لەسەری ، دەلیت : دوو بارە پیاوە کە ووتی : هاوار بۆ تۆ هەلسە هەولبدە ئەگەر شتیکت لایە بۆم بینە زۆر نارەحەتم و ئیجگار برسیمە ...؟! ئافرەتەکە دەلیت : بەلی . ئیستا تەنوورە دەکەینەوە پەلە مەکە ..!! بۆ ماوەیەك خیزانی پیاوە کە بی دەنگ بوو چاوەری دە کرد کە بانگی لی بکات ، پیاوەکەلەبەر خۆیەوەدەلیت مەگەر هەلسم سەیری تەنوورە کە بکەم ،هەلساو سەیری تەنوورەکەی کرد پر بوو لە (رانی مەر ) دەسارە کەشی پر بوو لە ئارد ، هەلسا دەسارە کەی تەکاندو هەرچی لە ناو تەنوورەکەشدا بوو دەری هینا لە رانی مەرە کە ، (ابو هريره) دەلیت:سویند بە وکەسەی کە گیانی (ابو قاسم )ی بەدەستە ئەمە قسەی محمدە (صلی الله عليه وسلم ) : ئەگەر ئەوەی لەناو دەسارەکەدا بوو هەلی بگرتایەو نەی تەکاندایە هەتا رۆژی قیامەت هەر بۆی دەهاری ..؟؟!!

[99] رواه أحمد برقم (٢٠١٤١) وصححه الالباني ،وة تخريج مسند شعيب لأرناؤوط برقم (٩٤٦٤).

## ✍نان خواردنی (عمری كوری خەتاب ) لە گەڵ گولیكی پەتا دار :

لە (كوری بریدە ) – خوا لی رازی بیت – دە گیرتەوە دەڵیت : ((أنَّ عمرَ أخذ بيدِ مجْذومٍ )) .[١٠٠]

واتە : (عمری كوری خەەتا ) نانی خوارد لە گەڵ گولیكی دەردەدار یان پە تادار دا ، بە ناوی خوای گەورە پشت بە خوا نانی خوارد ..!!

## ✍(خالد كوری ولید ) ژەهری خواردەوە :

لە (ابی سفر ) – خوا لی رازی بیت – دەڵیت : (( نزل خالد بن وليد ) (الحيره ) فقالوا له : احذر السم لا يسقيكه الأعاجم ، فقال : ائتوني : بسم الله .فلم يضر شيئا )) .[١٠١]

واتە: (خالید كوری ولید ) لە حیرە دابەزی (شاریكە لە نزیك بصرە لە عیراق دا )،پیان ووت: ئاگاداری ژەهر بە نەیخۆیتەوە لە لای ئەعجەمیەكان واتە : (ئەوانەی كە عەرەب نین )، خالید كوری ولید ووتی : بۆ بهینن ،بۆیان هینا ، گرتنی بەدەسیەوە خواردیەوە ..!! وە ووتی : بەناوی خوای ، هیچ زیانیكم پیناگەیەنی .

[١٠٠] -سنن الترمذي برقم (١٨١٨) .
[١٠١] - مسند ابي يعلي برقم (٧١٨٦) .

پێشەكی ........................................ ١-٢

گرینگی بابەتی پشت بەستن بە ( خوای بەرزو بلند ) ........................... ٣-٤

پێناسەی پشت بەستن ........................................ ٥-٦

حەقیقەتی ( التوكل ) یان پشت بەستن ........................................ ٧-٨

گرتنەبەری هۆكارەكانی ( التوكل ) یان پشت بەستن ........................... ٩-١٠

پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وەرگرتنی هۆكارە كانی پشت بەستن......... ١١-١٢

جیاوازی نیوان ( التوكل ) وە ( التواكل ) واتە : پشت بەستن وە پشت بەستووان ....... ١٣-١٤

حكم وبریاری شەرعی لە سەر پشت بەستن یان ( التوكل ) ........................... ١٥

هەمەچەشنی شیوازی قورئان لە بیانی فەزلی ( التوكل ) یان پشت بەستن ........... ١٦-٢١

ئەو پیگانەی باسی پشت بەستنیان تیدا كراوە................................. ٢٢-٣٢

سوودە كانی پشت بەستن بە ( خوای گەورە )................................. ٣٣-٤٢

پشت بەستن : زانینی دڵ و كارەكانی........................................ ٤٣-٤٨

ئەو كارە قەدەغەكرا وانەی كە پشتی پی دەبەستن................................. ٤٩-٥٥

لە چیرۆكی پشت پشت بەستوان بە ( خوای گەورە )................................. ٥٦-٦٠

سەربابەتەكان ........................................ ٦١